حەمە عەباس

# سێبەری خۆتم
# لێ حەرام مەکە

شیعر

چاپی یەکەم
٢٠١١



لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبی نما
زنجیرەی( ١٠٤ )

سەرپەرشتیکردنی پرۆژەی چاپی کتێب
ئیسماعیل کوردە، ڕێبین رەسوڵ

ناوی کتێب: سێبەری خۆتم لێ حەرام مەکە
بابەت: شیعر
شاعیر: حەمە عەباس
پیتچنین: شاعیر
بەرگ: سەرکەوت وەلی
دیزاینی بەرگ: نما
چاپی یەکەم: هەولێر/ کوردستان
تیراژ: ٥٠٠
نرخ: ٢٥٠٠ دینار
چاپخانە: شەهاب



لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی"٩٨٢"ی ٢٠١٠ی پێدراوە.

## هەرەس

لەخۆم تووڕە دەبم و

لەگەڵ خۆم ئاشت دەبمەوە

لە تووڕەبوونا .. خوێن

لە ئاشتیدا .. بەفر

بەفرەخوێن بەژنی تەمەنمی تەنیوە

ڕۆحم چرایەکی کزە

تیشکەکانی لە نەخشەی نێوچاوانمدا دەتوێنەوە

لە کۆتایی نزیک دەبمەوە

بەرەو سەرەتا دەچم

گرژیی ساتە سواوەکان

لەنێوان کۆتایی و سەرەتا

دەمکاتە چرکەیەک هەڵایسان

له دووره نیگای نەزۆکی
ئاسۆی خۆڵەمێشیما
تێهەڵچوونەوەی پاش هەرەس
تارماییە .. لەسەر لەپی شەو نووسراوە
دەیبینم و نایبینم
دەیخوێنمەوەو نایخوێنمەوە
تێیدەگەم و تێناگەم
ئەمەش سەرەتای هەرەسێکی ترە
سەراب نیە

## هەڵوەرین

١

ئازارێکم بەسوێ

لە کونجی دڵتەنگیمەوە

دەڕژێمە سەر لەپی برینی ساڵانێ نامۆییەوە

کولانکەیەک

لە قووڵایی زەمینەوە

بەسەر مردندا دەڕوانێ

لەوێ

چاوێکم لە کولانکەو

دەستێکم هێشووی برینم پێ هەڵگرتووە

چاوێکم لە مردن و .. دەستێکم

چەند ساتێکی خەو بینینم پێ هەڵگرتووە

٢

گوێزانیٚ سەرهەورازە .. ڕەشەبا

ڕووباریٚ ڕوو لەنشێوە .. زریان

لە پێچی کۆڵانێک

هەنگاوم دادەکوتم

تەماشام بەرەڵڵا دەکەم

هێندە نابا

تەماشام دادەکوتم

هەنگاوم بەرەڵڵا دەکەم

٣

کەناری ژیان

خەونەکانتانی تیا دەخوێنمەوە

بۆنی خوێن و ژار هەڵدەمژم

چەقی شێتایەتیم

سەمای فریشتەیی تیا دەکەم

گوێم لە دەنگی جنۆکانە دەنگمدەدەن

دەریای تینوویتی

نیشتمانێ روو لەتابووت

عەمباری برسێتی

لە نێوان

تەوقەی سنوور

و

گیرفان

مەسیحێک

خاچێک

داکشانی پۆلێ ئەستێرەو

پۆلێ ترو

هی تریش

٤

لە کەستانی ناکەمەوە

بەس لەبەر دەرگا بوەستن

لە روخساری مرۆییتان توورەم

لە توورەیی روخسارمەوە بمخوێننەوە

بێدەنگیم

لە فیچقەی خوێن موتوربە دەکەم

خۆم لە دواشیعرو

زلخەمی خۆم و

ساتەکانی مەستیم

لوول دەدەم و

دەنووووو...م

٥

خەونێکەو

هەموو شەوێ دەیبینم

مەرگێکەو

هەموو رۆژێ دەمبینێ

نیوەم خەونە

نیوەم مردن

سڵاوتان لێبێ

شەوانی منداڵیم

رۆژانی گەنجیم

هەموو ساتە خۆشەکانی پاش مردنم

سڵاوتان لێبێ.. سڵاو

# دابڕان

پەنجەرە

دەرگا

کولانکە

کونی کلیل

درزەچکۆلەو

قڵشە زلەکانم گرتن

چەند ساتێ

چەند هەناسەیێ

پاک وەک هەوای پێش ئادەم و

پاش وەجاخی تێکشکاوی

نەفرەتیان لێبێ

ساپیتەی ژوورەکەمیان

وەک کڵاوێکی زلی

سەرێکی بچووک رفاند

دیسان هەوای بۆنداری مرۆیان

لە دنیای خۆمیان دابڕی

# تارماییەکانی تێکەڵبوون

مەراقگیری کورتە دیدارەکانی پاییزەو
درێژە حەسرەتەکانی تەریفەیی
لە بەژنی بەربەستی کۆڵەگەیێ درۆینە
راگوێزانەوەی
شەرمەئازاریێ زەردەخەنەیی
بۆ رۆحی لێواولێوی
تامەزرۆیی دیدار سەراب

رۆحم بووە ختووکەی دڵنەوایی
تۆش برووسکەیێ ئازار
لە چۆڕاوگەی بەربارانێ پرووشەیی
دەتکێیتە دەروونی هەڵایساوم
بێئاگاییمان موتوربەی بێدەنگیێ کپ دەکەین
نهێنییەکان لە کەمەری
مێژووی کفت و داهێزراوی
سووتانە ئەزەلییەکانی رۆح و
بەستەڵەکی تارماییەکان دەئاڵێنین
زریانێ فریشتەیی

لەودیو روخسارە گرژەکان داماندەپۆشیٚ

لەویٚ

لەپەنا شەپۆلە سپییەکانی لەززەت

پێکەخەونی تێکەڵبوون

هەڵدەدەینە گەرووی هەنسکگرتووی لەمێژینە

چنینی تەونە موچوڕکی

جەنجاڵەساتێکی ئێرەو

هێمنەساتێکی ئەویٚ

مەلوٚتکەییٚ توندکراوی

نێو قوٚنداغەییٚ پەڕۆیی

سەردەمێکی بیٚ مروەتە

گەڕانەوە بۆ ساتە سپیلکەکانی منداڵێتی و

قەڵەمبازی شێتایەتیش

تەنووری شەختە گرتووی مەرام داناگیرسێنیٚ

هێی درەختی کێلەوەبووی چەقی سووتانی

کیشوەرگر

من ئازاری برووسکەیی ناخی خۆمم

بمگەیەنەوە بە ساتە هەڵەتەکانی ئەڤین و

سووتانە بە لەززەتەکان

## دڵشکان

کەپکە شاخی چیای مس
وردەتیشی تەپەدۆریان لێکەوتەوە
گریانە رژاوەکانی دەروونقاچاغ
لەهەنسکان گەڕانەوەو
ئەشقیای دەڤەری ترسن
ئەم هەڵەتانە هەڵەتەی کوێمان دەکەن

•

لەبزربوونی خۆماندا بزر دەبین
ناگەینە سەرەداوێکی سۆراخ
لە دۆزینەوەی ئەواندا بزر دەبین
ناگەینە بڵندگۆی مزگەوتێکی بێ منارە
ئۆه.. دیسان دەشکێم ودەبمە چەند پارچە
پارچەکانیشم لێکناکەن
وەک دڵی خۆم لە شکان راهاتووم
دەگریم و فرمێسکم لێتەریوە

وەک خەونی خۆم لە دڕان ڕاهاتووم

دەمرم و لە عزرایل تەریوم

وام لە ژووانی شکانی دڵی خۆم

نامەیەکی نیوە واڵا

بۆ نیوە پیاوانی

نیوە هەقیقەت دەنووسم

نهێنی نیە دایمەخەن

ئاشکرا نیە ڕایمەخەن

لە ژووانێکی دیکەی دڵم

خۆم دەدەمە بەربایەکی سەر بەرەوخوار

کە باران نەبوو بە هی من

دەستم بۆ با دەگرمەوە

لووتم بۆ با دەگرمەوە

ڕۆحم بۆ با دەگرمەوە

بای ئەستێرە دوورەکانی

ئەودیو بێژینگی دڕاوی هەست

کەمەری خۆت لە تەزووە تیژەکانی

موگناتیزی نزام دامەکەلێنە

نە ساپیتەم هەیە بتگێڕتەوە

نە پەنجەرە

نە دیوار

نە چەترێکی بچکۆلانەش

بارەو پاکمکەرەوە لە

میکرۆبی ئایدیۆلۆژیا

حەزیای نەریت

تەپکەی برایی

ببارە.. بای ئەستێرە دوورەکان.. ببارە

بمشارەوە .. لە شکانە نەشکاوەکان .. بمشارەوە

## گەمارۆ

تیفتیفەی سواخە پیسایی و
سوکایەتی و
رشانەوەی دەروون
بزماری ژەنگنی مێژوون
دەڤەری برینئاگری لەشم هەڵدەکوڵن
پەرداخێک خوێن
پەرداخێک شەراب
پەرداخێک بەنزین
رۆحم لە سێ ئاگر دەگرن
لە چرکەکانی سووتاندا
چاوەڕوانیم مشتێ خۆڵەمێشەو
بەسەر تەرمی سبەینێما دەپیرژێنم
دەبرژێم و
لەسەر سفرەی سپڵەکانا کێل دەبمەوە
جارێکی دیش دەبمەوە برینێ قەبەو

ئازارو شەونخوونیم هەڵدەچنم

هاوکێشەکان درۆن

لە نێوان باسک و بازوودا شتێ لە ئانیشک ناکا

لەنێوان ران ولاقا

شتێ لە ئەژنۆ ناکا

ئاودامانی برین ئاوینەی ئاوەژووییە

دەستەپاچەی دنیایێم و

رۆژێ نایێ بسێمەوە

نۆرە لەدایکبوونێکی دیکەم

چەند لێ دووووورە

## مەرگی چوار مەشقی

ئەم یەقینەش سەرابێ دیکەیە
لە کەلێنی تارماییە سپییەکان
دەڕژێتە سینەی کابووس لێنیشتووی
خەونە خەلووزییەکان
هەوراز لە نشێوان لێژتر
نشێو لەهەورازان رکتر
یاسا لە درزی دیوارێ
لێکترازانی خۆی هەڵدەخا

چاوشلکانێی شەوکوێری و
گەرمەغاری پابەستەییش
بەسەر هەڵقرچاوی رۆحما
سێبەری هانایێ کز نین
خوێن .. دەریا
فرمێسک .. رووبار
خوێ .. گەردیلە
هەناسە .. قەترە

- تەنها قەترەیێ —

چی ناودەنێن

تەرم لاناچن

سێبەر جوولەیانن

لە هێلّی ئیستیواوە سڵاوێ بۆندار

بۆ هەردوو جەمسەری زەمین

لە ئاڵۆزکانی دنیا ساکار دەبمەوە

ساکاریم لەسەر نینۆکی سائەیێ هەڵدەکۆڵم

پاش بانگەوازێ خنکاو

توولەرێی ئەو جەنگەڵانە دەگرمەبەر

سمۆرەی نهێنییەکانیان شاردۆتەوە

لەبەر بارانی تەماشا لێڵەکانی

ئەودیو چاڵایی مروەت

نوێژێ بۆ مەرگی خۆم و

مەرگێ بۆ نوێژی بێ دەستنوێژیتان

لە دەفتەری با دەنووسم

چوار مەشقی دەمرم و

بەپێوە خۆم دەنێژم

## خەرەندی خوێ

ئێسقانێ دەمرێنێتەوە
شەو هەڵبزرکا
لە چاوەڕوانییا
خۆمان لە هەناسەی هەڵمێ هەڵسوو
ئاسمان
لەپشت تەڵخە تەماشای ئەستێران
چەنگاڵ لەپەنجەی پێم گیر دەکا
بەفەلاقەی ئاڵایێ قۆپاوم دەکا

پنتێک چەقی گەردوون
پنتێک چەقی داتەپینم
لەسێبەری قوچەکەسەرابێ
یەکدیگیرو یەکدیبڕن

پێیەکم لێرەکێوێ لەخۆی بزمار
دەکا
دەریایێ لەوێ لە پێما دەنوشتێتەوە
گوێتان لەنێو هێلکە شەیتانۆکە بشارنەوە
گەواڵەیێ خۆی گرِدەدا
سووتانێ تەرِم
دەریایێ خۆی دەختکێنێ
شەپۆلێ وشکم
دەنگ وباسم بگەیەنن

## سەما

بەسۆتەکی سەر برینان وەدەنووسێم
وشک دەبمەوەو دەوەرمە
بەر سێبەرە نەسواوەکانی ئەڤین
لە بەرزاییان دەڕوانمە لوتکە
چاڵاییەکان
لە تارمایی خۆیان بزر دەبن
جمکە روانینێک

ئاوێنەی هەسارەیەکی بچکۆلەی زۆزانییە
رامان بە سیمای ساتەکان
دەستنوێژی شاگەشکەییمان پێ هەڵدەگرێ
بڕوانە
لەم خاڵی سەرەتایەوە
تا دواخاڵی ناکۆتایی

موعجیزەکان بەسەر لەپی شۆستەکانەوە
هەڵکورماون
خلیسکانیان بە هەناسەو
گۆرانییەکانمان دەسپێرن
ئەمە جادوویێکی سەوزی
سەرەتای کتێبێکی پیرۆزە
با لە سایەی سەما بکەین

## کەوانەی بەتاڵ

ڕەنگ نیە بە بنارگوڵی کێوی خەونێکما هەڵگەڕێم
دەنگ . . دەنگ
زریزەی پەراسووەکانم لێکدەترازێنن
بەسەر چەرمە قەپێلکما
نەرمەگۆشتم دادەڕژێننە سەر
کوانووی ئەفسوونی نەفرەت و
شەختەبەندی تابووت

چیتان داوە بەسەر منا
ئەژنۆکانم کلیل دەدەن
بووکەشووشەی نێو کەژاوەی
ڕۆحی چەماوەو شپرزەی ئایندەم
بە بزماری سنوورەکان بسمیل دەکەن

تەمەنێکی کڵافەییە
لە جۆڵلانەی بەر سێبەری
هەورە قژ تۆپەڵە بەفرو
درەختە قژ کچانییەکان
یەخسیرێکی باڵبەستم
نیگاکانم
لەسەر ئێسقان و
دواچۆڕی خوێنتان دەچێنم

تابووتی خۆمم
شاگەشکەییتان بە تاریکستانێ بسپێرن
سمێڵەخنچکەی توورەییم
لەنێوخۆما هەڵناگرم

# گێچەڵ

گریانێکی داگیرساو

سوێی ماچە شکاوەکانە

گۆلمە هەنسکێکی کوڵاو

وشکە ساتمەی بەر نینۆکی هەڵقۆچاوی

دەنگە مۆمیاکانە

نزای گەردەلوول سێبەری برینێکی بەنجبووی

راکشاوی سەر چیمەنی قونجرکەیە

هەڵەتەکان لە پێشەوەن

با لە قوچەکە هەرەسەکان تێپەڕین

داخوا لە قەڵادۆشکانی چ سیحرێ

سەرمان بە سەمای گێژەن مەست دەبێ

کەپرەکانی ئەم بنارەش ساپیتەی سواویان تەپی

ئەبلەق ماوم

چەتری حەرفەکانی فاڵچی

بەسەر هێشووی مرازی کێ پەرتکەم

نەوای هاوار لە درەختە بڕاوەکانی

چ دارستانێکی هەڵواسراو ئاشکراکەم

نهێنییەکان چیتر کەمۆی تاریکایی

ئەشکەوتە داخراوەکانی

پشت هەڵە تەدوورەکانی ناخ نابن

وەرزەکان دێن

ساڵەکان دەڕۆن

ساتەکان دەچەقن و

کراسە مارییەکانیان دەگۆڕن وهەر چەقیون

من کە پیاوێکی خووداری

خەیاڵ پڕ لە گەردەلوول و شەماڵ

بەدیار فیلمە درۆزن و ئەکتەرە دەجالەکانەوە

خوودەگرم و دەمامکەکان دەترازێنم

لە خووداریێتیم ببوورن

ئەمە داستانی من نیە

خۆم نەبێ کێ خۆی بەم لیتە ژەنگاوییە

دەشواتەوە

کێ خۆی لەم تیشە هەڵدەسوێ

شەهوەتی زمرەند

مەگیرانیی ئەزەلییەو لوولماندەدا

با لەم نیعمەتی مردنە بێبەش نەبین

رەنگی هەڵبزرکاوی سامالْ دەتکێتە چاومان

وشکایی هەور

لە قۆزاخەی تینووێتی و تامەزرۆیی کەمۆ دەبێ

رزینی کوڵەگەی ئاسمان و

چەنگاڵی زەمین

هەقایەتی گومان و

گەرەلاوژەی بەر سێبەری لاسکە گیایەکی

سووتاوە

ئەمە گۆڕستانێ رەنگاوڕەنگ

ئەوەش بەزمەوارێ خەڵووزی

با تەرمی کوڕەزاکانمان

قەتماغەی تابووتەکانیان هەڵدەنەوە

پێکی سەما پەمەییەکان بە شیلەی ئەم ژەهرە

خۆشکەن

دەنگمان بە زمانی پەڕیو دەسپێرین

بێدەنگیمان بە هاوارێ

فێربووین لەززەتی مردن مۆمیاکەین

خەونەکان کفن و دفن کەین

شمشێرەکان بەرمڵاکەین

منداڵبووین کە فێربووین .. منداڵ

منداڵانی چەقاوەسوو بمانبوورن وانەکانمان

قرێژی گوێی شەیتانیان تیابوو

مەمانبوورن یارییەکانتان

دۆشاومژەی ئەفسوونی ئێمەیان تیابوو

# ناستینکا

خۆم بەئاسمان دەمامکدەم

زەوی توورە دەبێ

خۆم لە خۆڵ بگرم .. ئاسمان

لاساریم لە جەمسەرە ناکۆکەکان دەنووسمەوە

هێمنیم لەسەر شەپۆلێکی توورە

ئاڵۆزی بوون تێمدەئاڵێ

دەرگای لە رێسمە چووی خەونە لەمێژینەکانم

کردۆتەوە

چاوەڕێی شنەبایەکم

بمکاتە دوو لەت

## خۆت بکە بە ناونیشانێ بۆ ئەم شیعرە

لە شکستەیی وەڕسبووم

رۆح لە باوێشک تێربوو

چەند چرکەیێ نەبینراو

شەوان خەونم پێدەبینێ

وەک لاولاوە بەژنگیرت دەبم

دەبمە نیگایەکی تەریفە

لە پەنا برژانگەکانما تێتدەڕوانم

نیگاکانمان تێکدەچرژێن

هێشتا تەمەن داگیرسان و کوژانەوەی تری ماوە

بۆ چاوانت وەک چرای بەختی من کزە

دنیایەکم لە تەمەنی گرمۆڵەبووم حەشار داوە

سێبەری شەرمت پەلە هەورێکی سپییە

وەک چۆن بچووکتر ببمەوە

لەچاوانما گەورە دەبێ

رەهێڵەیەو بەسەر پرچتدا دادەکا

ئەستێرەیەو خۆی لە چاوانت هەڵدەسوێ

بۆئەوەی تێهەڵبچمەوە

لە راستە شەقامی سینەم

دەست بە کەلەکەی نەمامی عەشقی

پێرۆکەبووت دەگرم

ساڵ دێو دەڕوا

وەك چۆن گەورەتربیت

لەچاوانما بچووك دەبمەوە

دەگەڕێم و

گوڵ و چەقۆ

شاگەشکەیی و نسکۆ

بەدنیادا پەخش دەکەم

## کات لە نێوان کیسەڵ و با

***بە - خەبات - ی هاوسەرم پێشکەشە***

بەبنمیچی چاوەڕوانییەوە کاتژمێر
میل بە ڤالیۆم بسمیل دەکا
لە گومانێ بەدمەستا رۆح
ئەشقیای بەنجی روخسەتە

کات کیسەڵێکە شەلو شیت
خۆڵەپۆک لە هەنگاوەکانیا دەبێتە تەمۆخ
بەسەر پێچکە شلۆقەکان سەرسمدەدا
سنگی مەراق دەمی شمشێر رادەمووسێ
بایێ بەسەریا هەڵناکا

سەرەتاتکێی نهێنیە ئاڵۆزەکان
سەرابستانی پشت دەریایێ مەنگە
دنیایەک هاو تخووب
تەپۆلکەیەک لەلم

ژووانە کورتیلەکانمان بەسەریەوە
پۆلە کێلی پیش ماڵئاواییە تەڵخەکەن

کات بایە
گوێزان بەشوێنیا رادەکا
چەنگاڵی سروشتی کیسەڵ
سرکە ئاسکی ئەم با بزێوە راو ناکا

کات دەریایە
ژووانەکانمان لەئاو دەبا
سێبەرەکان بە دیارمانەوە رادەکشێن
چرکەکان بەرِێمان دەکەن
دەستەو نزا
روو لەقودرەتی نهێنی چ داڵدەیێ سپیلکە کەین
لەبەر سێبەری چ میهرێ
کات دەستەمۆی باو کیسەڵ کەین

## پیرۆزبایی

شەو لە روانینم تێرنابێ

رۆژلە بێزاریی تێرنابم

لە تێکەڵبوونیان دیوانێ دەردەکەم

چامەی مردنی نیوەم و

کوشتنی نیوەکەی دیم بێ

پێش شەختەبەند گۆڕێ هەڵدەکەنم

قووڵ.. قوووڵ ..قووووڵ

لە بنەوەی زەوی کونبەدەربێ و

بەرەو ئاسمانی بنەوە

داکشێت و

داکشێت و

داکشێت

لەپشت خولگەی بینینی زەمین خوم دەنێژم

لەبرووسکەیەکدا

پیرۆزبایی بەجێمانی ئەم دونیایەتان لێدەکەم

## با ڕۆحمان
## لە بەفر هەڵسووین

لە درێژبوونەوەی درەنگایی
ئەم خامۆشییە جەنجاڵە
هەناسە گسکێ ددان شاش
خاڵخاڵۆکەی خەونە سرکەکانی تەمەن
پێکانیان
لە شوێنپێکانیان چەسپ دەکەن
داماڵینی ئەو هەورانەی کەڕی زمانی بارانن
بە هەڵمبوونی کفرەکاژو
داباربنی زەنگیانەی ئاونگی کاکۆڵنشینە

ئەوە عومرم چەند قەفێ بیگەڕێنەوە
بمبەرەوە ساتەکانی پێش بزربوون
ئەوەدڵم لە سندمێکا بیچێنە
کەخۆم سندمم کردووە

سووتانیٚ لەخۆ لوولدەدەین

هاڵاوی زۆزانیٚ بیٚ

بۆ پشکداری فێنکایی رۆحمان لەبەفر

هەڵدەسووین

من و تۆو بەفرو سووتان

جمکانەی مێژوویٚکی ئاڵۆزکاوو

جوگرافیایەکی شێواوین

مامۆستاکانمان

ئەستوونی باران وئاسۆی تەماشامانیان

لە خەرەندێکی سووتاو ناشت

نەبارانیٚ تینوویٚتیی شکاندین

نە تۆفانیٚ خنکاندینی

کە بووین بە هێلنجیٚ هەڵچوو

بەسەر جزووبەندی مێژوو و جوگرافیاو

دەموچاوی مامۆستاکان رشاینەوە

پەڕەکانیش

ئاخ پەڕەکان..هێشتا ماون

## تاڵنامەی باران

سەرهەڵدانی ئەم شەڕە کاولکارو گەردوونگیرەی نێوان من و باو خاك و گوڵ و درەخت و .. تەنانەت من و برادەرە هەرە نزیکەکانم، ئەوانەی تائێستاش تاڵەموو لەنێوان رۆحمان ئاسێ دەبێ و ئاسێ نابێ بە شکانی ملیۆنەها دڵ و رژانی چەند گەواڵەیێ خوێن دابمرکایە، نامەیەکم لە نێو پاس و ئاودەستخانەو سەردیواری کۆڵانە راقییەکان و تەختی تەوێلی خۆشم هەڵدەواسی، رمیەم لە دەف هەڵدەستاندو لە ئاهەنگی پاکبوونەوە خۆم بە لیتەی گەڕەکە میللییەکانی شار تیفتیفە دەداو گۆڕستانێکم چێدەکرد، ئەستێرەکانم سەردەبڕی و کۆمەڵنێژم دەکردن. ئەمە تاوان نییە دەیکەم، بەلاگەردانی ئەم شەڕە کاولکارەیە، بەڕژانی چەند گەواڵەیێ خوێن و شکانی ملیۆنەها دڵ، هەڵگیرسانی لە خەرەندێکی قووڵەوە چۆتە سەر شانی چیایەکی کەڵەگەت.

فریشتەی تاوانەکان هاتن

روویان لە تەنیمۆک گرتم

گوڵی نەفرەتیان

بەسەر سنگی دۆزەخیما هەڵواسی

ئۆخەی.. خۆ ماچیان نەکردم

*

گەر دەتانەوێ

لەژێربالی پەپوولەدا

سێبەرنشین بن

بەلقی درەختی دانەچەماوی شیعرەوە

پەلکە سەوزەی پێکەنین بن

سروودەکانتان ئاوەژووکەن

ئالای دەستتان سەربەرەوخوار هەڵگرن

*

لەسەر سەکۆی شەپۆڵێکا رادەکشێم و

گوێ لە ناڵەی دەریا دەگرم

خۆم بە گەلای درەختێ هەڵدەواسم و

ئازاری خاکم بۆ دەگێڕێتەوە
لە نێوان ناڵەی دەریاو
ئازاری خاک
برووسکە ژانێکم
دەچمە گیانی هەموو بوونەوەرێک

*

سیکاردێکی تیژم دەنێ
لەگەڵ ئەسپێکی شێ
پاشەوپاش سواری دەبم
دەچم ئادەم دەخەسێنم
مەمکی حەوا لە شیش دەدەم
کەهاتمەوە
دەبم بە میوانی رۆما
لە ئاگردانەکەی دەیبرژێنم

*

دارەبازەیەک
دوو مەیتی تێدایە
سەگێک
دوو گوارەی زێڕی لەگوێدایە

*

هەموو شتێکم

ژیانێکی شێواو.. و

مردنێکی رێکوپێکم

کانییەکی لیخن

زەلکاوێکی ئاوێنەیی

پاڵەوانێکی سەردەم

ناسنامەی ترسنۆکێکم

..م ..م هتد

لە هەموویانیش گەورەتر

کوێرێکی چاو گورگانیم

*

تریقەی گریانە

یا پرمەی پێکەنینە

گوێم کاس دەکا

کانیلەی بەهارە

یا تۆفانی خوێنبارینە

قەرسیلی ئەندێشەی شەوم رەباس دەکا

نازانم
ئێره ولاٚتی خێوانه
یا هەرێمی تاریکستانی مرۆیه
یانیش دۆزەخی بەرینی بن پەمۆیه

*

تینوێتی له بنارەوه هەڵدەکشێ
جامی ئاسمانیش بەتاڵه
ئەمڕۆ گەردوون
دەمخاته بەر چۆڕاوگەی تووڕەیی خۆی
کێ دەزانێ من شێتترم
یا ئەو
یا یاسای نێوانمان

*

له تەمومژی وەرزی نەهات
تارمایی خۆم بەدی دەکەم
پێ له کلکی مارێکی بریندار دەنێم
سەرادووم دەنێت و هەڵدێم
ئەم دنیایەی لێ کردوومەته دۆزەخێک

رۆژی سەدجار تیای دەسووتێم
دەڵێن ئەمشەو زووانی جوتێ ئەستێرەیەو
لەگەڵ یەکتر راموسانی لەیلاو مەجنوون
دەرگای بەهەشت دەکرێتەوە
ئەوسا منیش دۆزەخەکەم جێدێڵم و
لە کونجێکی بەهەشتا دەگیرسێمەوە

*

دڵنیابام شەپۆلی با
لە درزێکی خۆیەوە حەشارم دەدا دەهاتم
دڵنیابووم
دەبمە نهێنیی نهێنییە گەورەکان و
رۆژان بەرەو
ئاپۆرەی رووزەردیی دنیام دەبا
بۆیە نەهاتم

*

جارێکی تریش
ئاخنرامەوە ناو گۆڕو
چاوەکانیان خۆڵرێژکردم

ئەمجارەیان بۆکوێ هەڵێم
هەشتەمین تەبەقەی ئاسمان
یا لەپەنای ٣٢/ ١٣/ساڵی نەبوودا
هەڵکورمێم

*

سەرمابردووی بەربەرۆچکەی
چێشتەنگاوێ نیوەچڵم
لە ژووانی چەقۆدا
ئاوێزانی گوڵەپۆلووم
لە نێو گەردەلوولی سەمای
گۆرانییە قاچاغەکان
حەشارمدەن

*

وڵات جگەرەیە
سوڵتانێک
دەیسووتێنێ و
هەڵیدەمژێ
لەپی کراوەی سواڵکەران

تەپڵەکن بۆ سۆتەکی

*

هێندە بچووکم مەبینن

چاویلکەکانتان بشکێنن

گەورەترم لەو منەی پشت

چاویلکە شەوکوێرەکانتان

*

زەمینێ بزمار ڕێژ

زیندانێ تاکبەندی

دەنگێ بێ نووزە

هاوارێ بێ دەنگە

ژیانێ

رەگی لە دەریای هەنگوینبا

گیانێ

لەتوێی جەستەیێ بێ برینبا

*

هەنگاوێک

دوو هەنگاو

ناچمە پیش

نایەمە دواوەش

هەنگاوێک

دوو هەنگاو

قوولایی گۆڕەکەمە

لەوێوە نەفرەتتان لێدەکەم

*

شیرتان لە ملم هەڵسوون

تەمەنم لە تەمەنتان بدروون

دەستەمۆی گوڵەژەهری

سەر مەزاری شەیتان نابم

*

کڕنۆشێ بۆ فریشتەی مەرگ

باڵی خاڵخاڵۆکەی بەختم هەڵدەکێشم

چەقۆیێ کول

دەسرەوێنمە چاوی نیوەبینای خۆر

با لە تاریکستانی گۆڕ

پەلی تەنیایی بکوتم

چونکە

لە دەرەوەی خولگەی هەقیقەتەوە دەمبینی

دەخرامە بن مشکیی سەر گوفەکی کاولەگوندان

*

مێزێک ئاسایی

چوار کورسی سەراوقوون

هەشت پێ بەسەر مێزەوە

دەستڕێژی لووشکە دەگرنە

تەوێڵە تاوەسووتەکان

برینەکان دەزێن

تەرمەکان دەزێن

ئۆف گرکەنین

*

درەخت نییە ڕاکشاوە

تەرمی منە کێل بۆتەوە

خەرەند نییە پڕبۆتەوە

دەمی منە رووباری تفی تێزاوە

جۆگەلەکان

دەڕۆن بەرەو

دوا ڕوخساری مرۆی مێژوو

*

لە کولانکەی ژووریکی دووکەلاویدا
کیشوولەی سەرنجم هەلدەفری
بارستایی یاسا جنۆکەییەکان
خۆ بەپەڕی وەدەکەن
دەنگی کۆرسی جنۆکان دی
دەنگ دی.. ئەوە دەنگی منە
دەنگ دی.. ئەوە دەنگی تۆیە
دەنگ دی.. دەنگی حاشا درۆینەی ئیمەیە
دەنگ.. دەنگ.. دەنگگگگ

*

بەفری ماشوبرنجی
بەسەر چنگە پەمۆی قژما
رەنگەکان رەنگدەکا
مردن پەپکەی خوارد
تەلی تەمبوور واگای هینا
چی بوو..؟
ژیان چنگی ڤالیۆمی خوارد
کەپکە شاخی خرپ خرپ

چی نەبوو..؟

*

لەسەر تەختایی
دەمەگوێزانێکی ڕەنگگرتوو
خۆم لە کەمەندی
سەردوولکەیێ نەپساوەی
ئەم دنیا ترشاوە رادەپسکێنم
بۆ کویێ؟
سەرلێشێواوی نێوان
یاخیبوون و
دەستەمۆیی
بۆ کویێ؟!

*

لەسەر شانی ئەم گێژەنە
خۆم هەڵنادەمە کەناری داڵدەتان
لە کوڵی گریان و
زەردەخەنەی لێوانتان
ت..ت..ت..تۆقیوم

*

مێگەلێ جینجرۆک

بە بەیداخی نێوچەوانمەوە تەڕن
ڕەوە هەنسکێ
بە توونێلی گەروومەوە وشکەڵاتوون
نە بایێ هەڵدەکا
نە بارانێ دادەکا

*

لە زارکی کارێزی بێدەنگیم
هاوارێ رادەبێ
لە گەرووی سندمکراوی هاوارم
بێدەنگییەك
دامدەپۆشێ و
کاسم دەکا

*

چیا بەلادا دێ
ئاسمان دەکەوێتە خوارێ
گۆی زەمین وەك تۆپی پێ
بە شووتی یاریزانێك
لە چاوان بزر دەبێ
دەریاکان بەسەرماندا دەڕژێن

بڵێی پاکمان بکەنەوە

*

کە ڕێگایێ دەستپێدەکا.. دەستپێدەکەم
کە ڕێگایێ کۆتایی دێ.. کۆتاییمدێ
گەورەترین دەستپێکردن
لە گەورەترین کۆتایی مارە دەکەم
منداڵێکیان دەبێ ناوی دەنێم مردن

*

تەنکە خووزێ
بە فێنککردنەوەی نیوەم گەرمدادێ
هاڵاوێ وەڕس
بە گەرمکردنەوەی نیوەم فێنکدەبێتەوە
ئەوەتام
خۆم لەسەر چەقی
ڕێچکۆڵە یەکتربڕەکان چاندووە

*

قەبرغەی خۆم لە برینی کێ وەربێنم

شەوێک
ماسیلەی خەونە خەویم بۆ کەمۆ دەکا

*

بارستاییەک بۆشایی
کابووس
دێو
ئەژدیها
گۆڕێکە پڕنابێ
سیحرێکە هەمیشە پڕ

*

دووریی نێوانمان نەفرەت و
تەوقەی نێوانمان نەفرەت و
ماچی نێوانمان نەفرەت و
نەفرەتی نێوانمان نەفرەت
بیابانی نێوانمان
ئارامیی لە قەڕەپەستە وەستاوەکانی چاندم
دەچمەوە ناو خۆم
دەچمەوە دەرەوەی بوون

دەچمەوە ناو بۆشاییە بزێوەکانی لەناوچوون

*

ژارەبایێ

بەتونێلی کونە لووتان ڕۆدەچێ

گۆلمە گەردی ژێر سمی وڵاخی سواران

کانیلەی چاوان لێل دەکا

تیلمێ سێبەری

داوێن کێلی گۆڕی دزێک

ساباتی وەرزە نهێنییەکانە

*

سیسرکەیەک پێدەکەنێ

مووی سمێلی پەڕن

منداڵێک دەگری..فرمێسکی یاقووت

دەروێش لە هۆنینەوەی تەزبێح ناکەوێ

*

پەنجەرەیەک رووی لە شەوە

شەوێک رووی لە پەنجەرە دزراوەکانە

بەدیار شەوەوە

تەرمی ساتەکان دەنێژین

گویٚ بگرن

نەگرن

گۆرانییەک بۆخۆم دەڵێم

_ تەنها بۆخۆم _

*

بە هەڵمبوونی دوا تۆپەڵە بەفری لوتکە

وشکبوونی دوا کانیلەی بنار

نقومبوون لە تەنکاوانیش

نهێنیی دەریا دادەگیرسێنیٚ

*

کێلی گۆڕێکی تەریک

پەنجەیەکی فیکتۆر گارا

منارەی خەونێکی روخاو

لەبەر بارانی نەفرەتا

بەژنی سووورباوی مرۆییٚ تەریفەیە

خۆی فێنک دەکاتەوە

*

ئەستێرە داگیرساوەکانی نیوەڕۆ

لە پرسەی خۆری کوژاوە پێدەکەنن

تارماییە بێدەنگەکانی نیوەشەو
لە زەماوەندی تاریکستانێکی هەڵایساو دەگرین

*

بەسەر پشتی دووپشکەوە سەفەر
لەپاش پێشبڕکێ کورتیلەکانەوە
بۆ پێش پاشەکشە بەراییەکان
رەشبوون لەنێو دووکەڵی سووتانی
رفۆکەکانی ناخ
گریانێک نابیسترێ
شەوێک.. لە کات دابڕاوە
ئەشقیایی
تەرمێکی رنۆک پشیلەییە
وەک بنێشت بە خەونانەوە نووساوە

*

دەمم لەناو لەپم نەبوو
دەنا خۆم تفباران دەکرد
دەستم گەزێ درێژتر نەبوو
دەنا ئالآ کورتەبنەکانم دادەگرت

*

دوێنێ لە تراویلکەدا

روخساری ئەمڕۆم خوێندەوە

چرکەکانم شیتەڵکردن

ئەمڕۆش بەسەر باڵی شیعرێ

لە بەرزایی گۆڕێکی تەنگ

نوشتەیەک لە ملی گەردوون دەکەم

نهێنییەکانی دەروون و

یادداشتەکانی دۆزەخە

گوێ لە قرچەو هەست بە بۆکرووزم نەکەن

جارێکیتر سەربوردەی خۆم ناگێڕمەوە

لەگەڵتان پێناکەنم

ناگریم

نامرم

*

لە ساتە سەرەتاکانی لەدایکبوون

تا دواساتەکانی پیری

لە چاوەڕوانی شمشێرو گۆشەگیری

*

منداڵیم زەردەخەنەیەکی کاڵ بوو
بە ساوایی بوو بە هەڵم
گەنجێتیم گریانێکە
دەبیسترێ و کەس گوێی لێناگرێ
پیرێتیم دەبێ بە گالیسکەیەکی شکاو
نە زەردەخەنە رایدەکێشێ
نە گریان

*

دەمەوێ بگەڕێمەوە دیوەخانی
یەکەم ساتی دروستبوونم
بۆ ئەوکاتەی لە سکی دایکم
جگەرەم بە جگەرە پێدەکردو
دالغەم بەسەر ساتە لەئاو چووەکانی
پێری پەرتدەکرد
خوایەگیان چاوساغیم بکە

*

من و تەرمەکەم یەکتر ناناسین
ئەو مۆرە لەمن دەکا
منیش سەنگەری لێدەگرم
تفەنگەکەم لەسەر پێیەو..
کە تەرمەکەم بەلادا هات ناسیمەوە
دەچمە سەر گۆڕەکەی شین دەکەم
شینی رەش .. رەشتر
تا دەبمە دڵۆپێ فرمێسك و
دەرژێمە گەرووی خۆمەوە

*

سندمبوونی هەنگاوەکان بە رێگاوە
لە گوناهێکی تۆخ کاڵتر نییە
رێگاکان لە سڕینەوەدا گوناهەکانیان دەنێژن
هەنگاو بەلارێدا، بەرەڵڵایی.. هەڵکشان
خۆڵەپۆك بە هەستە
دوای هەر هەنگاوی سڕینەوەی شوێنپێ
با نەبن بەرێ

*

ئادەم بەناو ساڵ نەکەوتبوو
درەختێ رابوو
کۆترێ بەسەر شانیەوە هەڵنیشت
لێرەوە سنگی لە سێبەر گرتم
نیوەم لە سنگما هەڵکۆڵی فڕی
کۆترەکە وەرەوە
با رەسمەکەت تەواو بکەم

*

بارانەو ستوونی رێچکەی ونکردووە
خۆی داوەتە دەست بایێ بەلاری
بەسەر برینی خاك و
لەشی بێ سەرو
سەری بێ پرچ و
پرچی بێ رەنگ و
رەنگی بێ رەنگمانا
ئاسمانەو دڵۆپە دەکا

*

شەکەتیم دیوارێکی بڵندی
چواردەوری تەنیاییمە
گەر چنگێ نینۆکم دەبوو
جار جار پێیهەڵدەگەڕام
ئاخ نینۆکەکانم بیرتان دەکەم
ئەوسا بەسەر پەنجەکانمەوە بوون
وەک ئێستا هەڵنەوەرابوون
وەک ئێستا شونبزرو
وەک ئێستا ...

*

سواڵکەر دەست لێکتر پاندەکەنەوە
جەردە یەکتر دەکوژن
لێوەکان
لە درزە مووییەکانی نێوان
برسێتی و خوێن
یەکتر دەمژن

*

دۆزەخم و

دەرگام لەخۆم خستوّتە سەر گازەرەی پشت

بەهەشتم و

دەروازەی خۆم داخستووە

نیگام بە گەردەنی

کولێرەیێ نەبرژاوی

لادیواری تەنوورێکی

نیوە گەرما هەڵواسیوە

*

کە لە زستان ورد دەبمەوە

دەڵێم رەنگبێ

هەناسەی منی دزیبێ

*

کەرپووچێ لە گوێچکەمە

لە کەرتە ئیسفەنجێ دەچێ

لەگەڵ بادا دەقۆپێ

لەگەڵ بارانا ورد دەبێ

*

له سه‌رده‌می خۆم شێتگیرم

گێچه‌ڵ به‌ دوێنێم ده‌که‌م

سبه‌ی له‌ جانتاکه‌مکه‌

ده‌گه‌ڕێم له‌ رفۆکستانێ

به‌ ددانه‌ که‌وتووه‌کانم

گۆڕێکی بۆ هه‌ڵده‌که‌نم

دوایی

له‌سه‌ر په‌نجه‌ی پێی شه‌مووله‌کێوێ

سه‌ردوولکه‌یێ تێهه‌ڵده‌که‌م

*

له‌ ترسێکه‌وه‌ بۆ ترسێکیتر

له‌ دۆڕانێکه‌وه‌ بۆ دۆڕانێکیتر

له‌ خه‌ونێکه‌وه‌ بۆ خه‌ونێکیتر

له‌ نیگه‌رانییه‌که‌وه‌ بۆ هه‌مان نیگه‌رانی

*

پیاسه‌کانی هه‌ور

ئاره‌قه‌یان لی به‌رده‌بێته‌وه‌

سوورێک .. دوو سووڕ

غه‌زرینی هه‌نگاوه‌ تێکشکاوه‌کان

ده‌شکێنێ

*

شووره‌كانی له‌شم

له‌ چه‌تریێكی غایه‌ن ده‌چن

ناهێڵن جه‌ندرمه‌كانی ناوه‌وه‌م لار ببنه‌وه

*

پێیه‌كم وا له‌ دۆزه‌خا

پێیه‌كه‌ی دیم راده‌كێشێ

ده‌ستێكم وا له‌ به‌هه‌شتا

ده‌سته‌كه‌ی دیم وه‌ده‌ر ده‌نێ

*

كه‌ سه‌رماو سۆڵه‌ی كێوه‌كان

له‌ په‌لوپۆو له‌ گۆم ده‌خه‌ن

خوێنم ئاگردانێكی ناپاك و

به‌دیارییه‌وه‌ هه‌ڵده‌كورمێم

له‌من وابوو ناپاكی گه‌مارۆی داوم

كه‌چی وه‌ك خوێن له‌ خۆما حه‌شارم داوه

ته‌نها ترپه‌كانی دڵم

بە فریای پاکبوونەوەم دێن

گەر مانبگرن

*

چ دەکرێ لەگەڵ وەرینی

مەمکی سروشت و

مەرگی با

*

لە گەرمەی چڕینی ئاوازە تەپەکانەوە

سەمای کیسەڵ و

چاوچاوانێی شەمشەمەکوێرە

نوێژم پێ بەتاڵ دەکەن

لەبەر سێبەری نینۆکی دەریایەکی وشك و برینگ

دەستنوێژ بەچی هەڵگرمەوە

تەیەمومیش لێرە

دەستنوێژ وردوخاشتر دەکا

*

عەبایەك بۆ یاسا قاچاغەکان

ئالآیەك بۆ نهێنییە ئاشکراکان

تابووتێکی نەفەسبڕ

بۆ سروودەخەسیوەکان

*

وانە لینگەو قووچەکانی دادپەروەری و حوکمی یاسا

بوونە وەرزش

تۆپتۆپێنێکی تیا دەکرێ ..چ تۆپتۆپێن

شاپ لە تۆپە قەوارە بەتاڵەکانی

وانە بۆیاخکراوەکانی

ئەوێ دەمێ دەدرێ

تۆپەکان چەند بچووکن

وانەکان چەند چرووکن

*

دەستەمۆیی سرک نەبا

قاچێکم دەکردە ئالآی قەرەجێتی و

لە ئیمپراتۆریەتی ناوەوەم هەڵمدەواسی

ئەو ئیمپراتۆریەتەی

دەسەڵآتم بەسەر سوچێکیدا ناشکێ

*

ئەم تەختە بەسەر

پایە لەرزۆکەکانیەوە ناوەستێ

گۆچانێک

دوو گۆچان

ده گۆچان

گۆچانستانیش

ئەم تەرمە بزێوەی پێ هەڵناگیرێ

*

شووشەکان شکان و

تیشەکانیان چوونە ناو خوێنەوە

پەنجەرە بە نایلۆن گیران

بەیانییەک لەخەو هەڵناستم

لێفەخوێنێکی گەرم .. گەرم

بەخۆم دادەدەم

*

قەڵەم تەزووی کارەبایە

کە دەمەوێ

شەرەفنامەی قەحپەیەک و

داستانی ترسنۆکێک و

مەرگنامەی پشیلەیەکی مەزن بنووسمەوە

ئاخ بۆ ئەو ساتانە هەڵدەکێشم

که زمانم ئازاد دەبێ و

دەفتەرو قەڵەمەکەم تێهەڵدەدەمە سوچێکی مۆزەخانەوە

*

وام بەسەر دارتێلێکەوە

چەند مەترێک بڵند

دەستم بەردەم دەکەومە ئاسمان

بمبوورە ئەی زەمین

ناتوانم خۆم هەڵدەمەوە سەر پشتت

*

شەو لەبۆنی رۆژ دەترسم

رۆژ لە بۆنی شەو

کاتێک نیە

ئاسوودەییم بخەمە ناو لۆچەکانی و

سەرخەوێک بشکێنم

*

ترس بەسەر دیوارە تۆکمەکانی بادا دەخشێ

رۆحم لەنێو ئێسکبەندی پەنجە بزمارییەکانیەوە

یەخسیرێکی دەستبزێوە

دەست بۆ مەمکی برینە گوڵاڵەییەکانی

فیلمە سەیروسەمەرەکانی خەون درێژ دەکا

ئۆف لەدەست ئازاری ماچە درۆینەکان

سەری گێژم لەم زەلکاوی ژەنگەوارە هەڵدەکێشن

تووڕەیی دەپووکێتەوە

دەئاوسێ

دەتەقێ

گەردیلەیەکی وێڵی پاش تەقینەوەم

بەدوای پێکهاتەکانما دەگەڕێم

لەسەر سیڕاتی مەرامی خۆم دەبوورێمەوە

سەدەکان

سەدە کورتیلەکان

دەنک ..دەنک تێدەپەڕن

لەمن هیچ و لەوانیش هیچ

ئەی ئێوە چین؟

رەنگوڕووتان لەوە ناچێ

فێنکایی دۆزەخەکەی منیان هەڵمژیبێ

# نسکۆی چرکەکانی خەتا

زیندەخەوی بەهەشتە دوورەکانی ئەویٚ بوون
ریٚگایان لەبەرنام و عەسایان پیٚیەڵگرتم
سەرمەستی کەرنەڤاڵی لەززەتی خەون بووم
کە تەتەریٚکی غەوارە نامەیەکی بیٚ ئیمزاو میٚژووی بۆ هیٚنام
خۆم دەخیلی فاڵچیەکی میهرەبانی ئیٚرە کردو
بەخشندانە
چرکەکانی دواین رۆژی تەمەنمی خستەسەر لەپی دەستم و
گوتی دڵتەنگ مەبە
چی لە عومریٚکی وا دریٚژو
پەلکەزیٚرِینەی گیراوی ئاسمانیٚکی زەلیل دەکەی؟
ترس رەنگی پەرِاندم و رۆحی سەقەت هیٚشتم
وەک تیلمە پەرِۆیی بیٚنویٚژ
بەسەرئانیشکی درەختیٚکی سوتاوا هەڵیخستم
ترس ئاخ هەرترسەو

کۆلانە تەنگ و تاریکەکانی جەهەننەمم بۆ رادەخا
ترسەو رۆحم بەدەستی خۆم پێدەکێشیٚ
کوا دەستمن
بمبەخشن
ئەوانەی لەخشتەمبردن و چەپڵەم بۆلێدان
ئەودەستانە هی خۆم نەبوون
ئەوانەی تفەنگم پێوەنان و پەکم خستن
ئەودەستانە هی خۆم نەبوون
ئەوانەی سحربازانە گۆرانیم بۆگوتن و
سەمای ساویلکانەم پێکردن...بمبەخشن
بمبەخشن و
دەنگوباسم بگەیەننە کورەزاکانم وبڵێن
باچیترلەبەرپەنجەرەی ئەوشەوانە دانەنیشن
گەردەلوولی یادی منیان بۆ دەهێنیٚ و
لێنەگەڕێن کوندەپەپووی مەرامگیریم
لەسەر سواندەو ستارەکانیان هەڵنیشیٚ

زیندەخەوی بەهەشتە دوورەکانی ئەوێ بوون
ڕێگایان لەبەرنام و عەسایان پێهەڵگرتم
ڕێگاکان بەدەست قودرەتی قەدەرێکی سەرکێشەوە
مەیلی ئاوەژووبوونەوەی لێژاییەکانیان هەڵمژی
جورئەت ناکەم شوێنپێی چاوساغێ هەڵگرم
خۆم چاوەکانیم لەقامیش ئاخنیبێ
شەرئەنگێزەیی ناخی خۆم
گوێ لەقاقای ئاسمانی سەر ئەم وێرانەیە بگرەو تێبگە
چنگەڕنێی تاریکەشەوان ناتباتە
پشت سووتانی دارستانە بخوورییەکان
روو لەمیحرابی رووخاوی پەرستگاکەت بکەو
چاوەکانت بەهەردوو لەپت داپۆشە
هاتی و بەسەر نەهاتی ساتەبەزمگێڕەکانتا کەوتی
تەنها بەشی چرپینی لاوژەیەک ماوە :
نەگەییمە تۆزی باڵگرتووی مێگەلی ئەوان و
دواسێبەرم نەکردەبەر بەژنی خۆم و
دەستم لەپنچکان بەربوو

# نەبوون

کزەبایەکی سەر مەست دێ
دەست دەنێتە بنباڵمەوەو
بەرەو شوێنێ هەڵمدەگرێ

کزەبایەکی سەرمەست دێو
سینەم تونێڵی ئاگرە
کە سەمەندەر لەسەرمانا هەڵدەرزن رووی تێدەکەن
- پیل- ی پێیەکانم مردوون
هەنگاوەکان بەیەکەوە گرێنادەن
گەرووم هەرکی وشکەوەبووی
بەر پێخوستی
رەوەگورگی
ساتەوەختی
ئەم سەگوەرەی لێگیربووە
لەناو دەقنەی مێژووی هاودەم نیوە نوقمم

شرِه لانكێك
منداڵێك خەونی تێدا دەبینێ
خەونی خۆش خۆش
دەچم لێیدەپاڕێمەوە
لاڕوومەت و نێوچەوان و
چەچەكانیشی ماچدەكەم
بەڵكو دڵی نەرمبێت و
خەونەكەیم لەگەڵ بەشكا

كزەبایەكی سەرمەست دێ
لانكی منداڵ وەك هزری من دێت و دەچێ
من دڵتەنگ و
منداڵەكەش مەستتردەبێ
ڕەشەبایەكی بەدمەست دێ

## له منداڵیت دەخۆمەوە

بۆ کریڤـا ی کوڕم

زەمانی رمانە

قوچەکە بەردینەکانی تەمەن چۆکیان شلبوو

زەمانی گۆچانە

دەنکەترێکانی چاو وشکبوون

ناونران مێوژ

مام زۆراب کردیە شەراب و

زۆراب بەگێک هەڵیقوڕاند

زەمانی هیچە

تۆ لەم زەمانی  هیچەدا باوکایەتیم دەکەیتەچی

من لەم زەمانی هیچەدا

چۆن باوکایەتیم بکەمە درەختێ پرچن و

سێبەر لەم بەژنە دەوەنیەت بکەم

کە یەکەم پێکە گریانت رژاندە سەر ئەم کەونە بیابانییە

من پێکی بێدەنگی خۆم هەڵدا

بێدەنگبوون لە شەرمی لێکنەکردنەوەی هەڵبژاردنی

نەفرەت یا ستایش

بێدەنگبوون لە شەرمی لێکنەکردنەوەی نازناوی
باوک
یا
دوژمن
بێدەنگیەک تلانەوەی رۆحێکی گوناهبارو بێگوناهی
زممەنی زمماوەندە بێڕەزمەکانە
دەزانم تۆش گوناهێکیت
لە دەفتەری گوناهنومای منا
سەمایەکی نابەدڵی بەردینیت و
لەناو قوتووی نەستەلەدا
تاڵاوێ دەنۆشی
دوایین ترپەی دڵەکوتەی یانسیبێکی دۆڕاوە
رژاوەتە گەرووی بەستەڵۆکی سەدەی تاریک
سەدەیەک بێبەشە لە زاوزێی تەمەن و پاکیزەیی

من منداڵیتم خۆشدەوێ
با منداڵێتیت پاکێتی ماڵەکەمبێ
بچووکیت بیلبیلەی چاوی شیعرێکم و
دەتکە زەنگیانەی ملوانکەی ملی دایەو

تکە ئاونگی سەر پەلکی درەختی خەونەکانمبێ
دە هەڵسە وەرە باوەشم و
وەک سووککردنی ئەم بارەم بەشێکی تەمەنم بۆتۆ
باڵەکانت بکەرەوە
دێمە باوەشی _ئاوی _ ت و چۆڕێ پاکیتم بدەرێ

ئەم بەیانییە کە لەخەوڕابووم
ریشم تاشی و خۆم خستەناو جلەکانم
چوومە بەردەم ئاوێنە بەژننوماکە
دەتگوت خۆم بۆ ژووانێک تاسولووسداوە
رەنگە ژوانی مەرگبێ..مەرگ
ئەی خەرەندە موگناتیسییەکەی
پشت رێگا نشێوەکەی کورتەپیاسەی ئێوارانم
کی بۆتۆ گەورە نابێ
ئەم بەیانییە دەڵێی خۆم بۆتۆ تاسولووسداوە
ئاوێنە بەژننوماکە هەرئەوەتە نایەتەگۆ
پێڵاوەکانم بەسەر یەکا کەوتوون و
ژوورەکەم وەک ئەشکەوتێکی گەورەی چیرۆکە ئەفسانەییەکان
پژمەی تیا دەنگدەداتەوە

کریڤ وەک بالیفۆکەیەک
بەسەر لەپی منا دەخشێ
وەک ئەوەی نیگای چووبێتە بەرایی
دەگری و بەسەر پەیژەی ئێسقانەکانمدا
دەچێتە قەڵادۆشکانی خەونێکی بەئاستەم زیندوو
مەگەر لەگەڵ دەستنوێژی هێشتا نەشکاوتەوە
زیندوویێتی بە خەونەکانمان بپۆشین
دەنا لەم مەرگستانەدا
خوێنی نەمەییو کوا ؟!
کریڤەکەم گەورەیەو
لە نەخشەی تەنگ وتریسکی
لێکدانەوە ئاڵۆزەکانم جێینابێتەوە
کریڤەکەم بچووکەو
لەکەلێنەئەشکەفتییەکانی پەنجە سڕەکانم بەردەبێتەوە
خودایە چیبکەم
تا نهێنی ئەڤینێکی گەورەی
جەستەیەکی بچکۆلانەم بۆ بەرزەفتبێ
کە هەمیشە لەچاوانما زیندەخەون و
لەخەیاڵما شیعرێکی دوانەهاتووە

## تۆ لەغوربەتیا دەمریو منیش لێرە
## لە خاچ دەدرێم

### بۆ هەندرێن

خۆشیت بەچی دێ کەچنگت لەسینگوڕکی
عومرێکی نەزۆک گیردەکەی
خۆشیم بەچی بێ کەگیانم بە مشتێ ڤالیۆم سڕ دەکەم
ئەمە جمکە پرسیارێک بوو
لەشەوێکی سەرخۆشیما
وەک جگەرەیەک دامگیرساند

ئەو شەوانەی
رێژنەماچ و بارانیان تیا سندم دەکرێ
بەدیار دەفێکی ماسۆشی و
چرایەکی قەت دانەگیرساو و
بخوورێکی کوژاوەی ژوورێکی چۆڵ
ئاهەنگی لەدایکبوونی
مەرگە زەبەللاحەکانی ئەو رۆژانە دەگێڕین

تەنکەسێبەرەکانیان تیا نغرۆ دەبوو

کات سوڵتانە

ماتماتیکێکی نوێتر بەگەردنیا شۆڕکەرەوە

منیش لێرە بەدوای پێیەکی قالب بەتاڵ

بۆ پەراسووی پەیوەندییەکان و

قەفەزێک بۆ دیلکردنی ئەو خەونانەی

شەوان جارجار دەیانبینم

چوومەتەناو سپرینگی ژەنگگرتووی کات و... دەشزانم

هەموو قەفەکان دەبڕم و

لەوسەرەوە

تەنها

زەمبیلەی بەتاڵ و

سەرەسووڕەیەک و

چیتر

خدووم بە هەڵگرتنی ریخۆڵەکوێرەکانەوە گرتووە

تەلیسمی ناکۆکیەکان و خەناوکەی یادە کاڵەکان

وەک زنجیری ساقۆی منداڵیم کەللۆسن

ناتوانم پەنجەکانم بکەم بە تەیمانیٚ
بۆ نەزەرگایەکی بیٚ ئاڵای جەنگەڵستانیٚکی دۆزەخی
دەبیٚ لە حەوزیٚکی بیٚهوودەییدا
خۆم وەک بیٚچووەکرپیٚوەیەک بتویٚنمەوە
بیٚنویٚژیک خۆیم پیٚ بسمیلکاو
لەکەلیٚنی مەمکەکانیا ببمە هەڵم و
پەنجەم بخەمە نیٚو پەنجەی دووکەڵی جگەرەی تۆو
بفرم
جگەرەکەت لەعومری لەئاوچووم دەچیٚ
سووتان
دووکەڵ
قەزەمیٚکی بەکترییی و
لەپشت چاویلکەکانەوە دەداڵغیٚ
تا لەژیٚرچەپۆکی پیٚیان
ژووریٚکی بیٚ پەنجەرەو
بیٚ دیوار و
بیٚ نویٚن
ئاوەدان دەکاتەوە
دیوارە کاتخۆرکەکانی ئاوەدانی پەمۆن و

لەکونەلووتمان نابنەوە

لەمێژە

هەست بە تەنگی هەناسەی خۆم دەکەم و

لە پیاسە نەبڕاوەکانی

بەرچڕە دووکەڵ و

گەردەلوولی هەناسەی مرۆیان وەڕسم

بۆ کونجی تەنیاییم تەنها

نائاگایی ئەو شەوانەم بەدەستماوە

شووشەکانیان تیا وشکدەبێ و

منیش تەڕ

# ڕەوینەوەی ئاسکەکانی خەیاڵ

پرسەی بەژنە ڕاکشاوەکانی سۆزە

بێ باوێشک مەل بەئاسمانەوە دەنوون

گلێرەکانی ڕوانین

بەسەر پێستی قلیشاوی زەمیندا پەرتدەبن

هەردوو گلێنەی چاوانم

کە وەک جوتێ کەللا شووشەی

سەردەمی منداڵێتیمن

لەژێر دوو تۆپەقوڕ دەشێرمەوە

چاوە کزەکانی یاد هەڵنایەن

لەتاریکیدا گوێکانم بە چریکەی شاڵووری ڕۆحم پڕدەکەم

پڕ وەک سکی دەرپۆقیوی

قەیرەکچێکی تووکنی

ئاواییەکی مێیینەی دووووور ..دوور

لەسەر منارەی مەرگەوە

دەڕوانمە ئەو چنارە خەمۆکیانەی

سەری کزیان ناوەتەسەر کێلی گۆڕەبەتاڵەکانی بروسکە
بەبینینی ئەشکەفتی برینی خۆم شاگەشکەم
کاتێ لەژێر دارە مەیتی حەکیمە بەنگکێشەکەیدا
خۆی بەگریان مەستدەکات و منیش
پێکەنینم دەڕژێتە ناو چاڵەمۆری ئەو شوێن سمانەی
وشکترلەشەپکە ئاونشینەکانی قەراغ مردن
ڕەنگرێژی سنوورەکانن
ئەمشەو خۆم خڕ دەکەمەوە
ماڵئاوایی لەسرودە گڕەکان وگۆرانییەکانی ئاو
دەکەم
دەشزانم سبەی دەبدەبەی هزرم دەتەقێ
چاکتر وایە لە ناشتنی کەرتێ سێبەری خۆمەوە
دەستپێبکەم
بەرەو..خۆشم نازانم بەرەو کوێ
وەک زیندەخەو لە مردن دەچم وناچم
وەک سێبەری کراوەی خۆم لەمرۆڤ دەچم و ناچم
وەک ناخی خۆم لەمەیدانی پیرەشەڕێک دەچم
پیرەشەڕیکی بەپێوە داکوتراوم
بەسەر رووی زەردهەڵگەراوی مێژووەوە هێلنج دەدەم

**ماڵئاوایی لە گۆرانییە گرەکان و سروودەکانی با**
**دەکەم**
**خواتان لەگەڵ ئەو رۆژانەی بەپێخواسی**
**بەسەر مافوورە تووکنەکانی بەهەشت**
**بەدوای فریشتە چاوبازەکاندا غارماندەدا**
**خواتان لەگەڵ مەنجەڵە رەنگاوەکانی دۆزەخ**
**رۆژانیک بەرووتی مەلەمان تیا دەکردن**
**ئێستاش جێگای ئەنگوستێکم ناکەنەوە...**
**خواتان لەگەڵ**
**ئەمشەو دەچم بۆیاخی نینۆکە کریستاڵیەکانی**
**کچە دراوسێکەمان دەدزم**
**هەر هەمووتان خواتان لەگەڵ**
**تا گۆرانییەکانی ئاو و سرودەکانی (با)ش...**
**خواتان لەگەڵ**
**تەنها نینۆکە کریستاڵییەکانی کچان**
**شەوتان خۆش**

## پیاسەکانی بێهوودەیی

کت ومت گەمەی سەرەتاکان بوو

رژایە سەر خۆڵی بانیژەی تەپیوی

بەر رۆناکی ئەستیرە سەرخۆشەکانی

شەودرەنگان

وردە کرێوەی هەناسەم

بەسەر باڵی هومادا

کردە دیوارێکی بێ ئەستوندەی

رۆخ چرایەکی هەڵوەریو

پێش ئەوەی لەخۆم بترازێم بارستاییەک بووم

بەتاڵ

ئێستاش قەبارەیەکم و

تەرازووێک بەهەڵبەزودابەزی من لاسەنگ نابێ

شەڕەکانی سەردەم سووکن

دەنا لەمێژبوو

قەفەزی سینگم کردبووە شیشەبەندی
کەوننشین

دەگەڕێمەوە سەرەتا
دەچمەوە کۆتایی و...دێمەوە
سەرەسوورەی سەفاو مەروای حەجێکی بەتاڵ
ناهێڵێ
لەسپێدەی پێش کونەلووتم رامێنم
خەواڵوویم بووبەتانەی سەر دوو چاوو
غایەنێتی پەناگەکان سەرخەوێکیان پێنەشکاندم
ئەوە چ عومرێک بوو رۆیی
چ ئافاتێک بوو هات

## پەراوێزەکانی شەڕ

**١**

**کوژراوەکان**

**بەشوێن دۆخینی دزراویان**

**مارشی پەژیوانی دادەگیرسێنن**

**تەنها تفەنگ**

**ناوەناوە دەکۆخێ و**

**نێرایەتی خۆی دەکاتە ئاڵای**

**وڵاتێکی بێ ئاڵاو**

**بێ نەخشەو**

**بێ...**

**٢**

**ئازادیمان**

**گەندەفتوای هەڵکۆڵراوی**

**بنهەیوانی نینۆکەکانی شایە**

دڵی نەرمی چاوەکانی خۆم شکاندو
گوێچکەم دایە بەر ئەو ئەستوندانەی
قاچاغچێتییان بەدەنگوباسەکانی ئاسمان و زەمین
دەکرد
دەنگوباس شێرپەنجەی گوێچکەو
گوێچکە دەرگای چونەژوورەوەی شێرپەنجەی
سەردەمی ئاشنایەتی من و
جووتە پێڵاوێکی دڕاو

٣

دوێنێ بەشەقامێکا تێپەڕی
ئەمڕۆ تەرمەکەی پێدا هاتەوە
تەرمەکان بەڕێوەن
تەرمی هەموومان
چەند کڵۆڵە شەڕ
تەنها ئەو دەمێنێتەوەو نابێتە خاوەنی تەرم

٤

هەناسەشیان دەکردە دووکەڵی جەنگ و
ئێمەش یادی ئەو قالۆنچانەمان دەکردەوە
گوویان دەکردە گۆو وەپێش خۆیاندەدا

٥

لەبیریان نەبوو
یان نەیاندەویست دەستنوێژهەڵگرن
بەئاشکرا نوێژەکانیان دادەبەستاو
بەنهێنی چەقۆکانیان لەبەردەزوورگان هەڵدەسوو
وایاندەزانی فریشتەکان لە ریاکانیان بێئاگان و
بەدەفتەری نەنوسراوەوە دەچنەوە حزووری خوا

# پارچەیەك لەخەون

زۆرجار قولابم خستۆتە نێو روباری پڕ لەماسی و
دەستبەتاڵ گەڕاومەتەوە
زۆرجار نامەم بەپوشکاغەز بۆ ئەستێرەکان
ناردووە
چوومەتە سەر بڵندایيان
دەست و نیگام هەڵبڕیوە
نە ئەستیرەیەك چەنگاڵێ
نە ئەستێرەیەك هەواڵێ

وەك هەرشتێکیتر
ئاسمانیش ساتمە لە گەردیلەیەك دەکات و
نینۆکی هەڵدەقۆچێ
وەك هەرشتێکیتر
ئاسمانیش ژانەسەرێکی سووك دەیگرێ
بۆشکاندنی سەرخەوێك

لەسەر ئەم زەمینە ڕادەکشێ و

ئاسمانێکیتر بەخۆیدادەدا

منیش بەسەر لەپی ساتە کریستاڵییەکانی

ئەوێدا

گەشتێک بەنێو چراخانی ئەستێرەکاندا دەکەم و

جوانترین ئەستیرە بۆخۆم گلدەدەمەوە

ئەستێرەیەک

لەئەستێرە نەبێ لە هیچ شتێکیتر نەکات

ئەستێرەیەک کەڕۆیی لەگەڵ خۆی بمبات

# وڕێنە کێویلکەکانی
# پاش نیوەشەو

بەسەر کەرتکبوونی خەون و گرتنەوەی ئێسکی
چەقۆکان
قەڵەمبازمان هەڵداو کەوتین
زیرەمان گەییە ئاسمان و
لەڕێسمانان خاکی بەرپێمان بنکوڵبوو
ختووکەمان کەوتەژێر ڕنەی جامبازە
فریودەرەکانی
شار و
شارۆچکە و
گوند و
گەڕەك و
کوڵان و
ماڵ و

تەنانەت ژووری تەنهایی ڕەبەنەکانیش

گوڵەکان وەرین و

پەپوولەکان جێیانهێشتین

ئەمەکداری دووپشکەکان موعجیزەیەکی گەورە بوو

بەدیار ئەبلەقیمانەوە

ئاوابوو چەرخی زێڕینی سەرتوێژگرتنی برینان

مانگی شەوە سەفەرییەکان

بەودیو گردۆلکەی حەسرەتە جیوەییەکانا داکشا

هێندەم ماوە روو لە فنجانێک بوەستم

بمخواتەوە

ئەو ڕەنگانەی پارچەیەکی ناوەوەم لێ

دەشێرنەوە کاڵنابنەوە

ناچارم لەچەقێنەکانی سارای خەیاڵ

بە داری تینووی بریاوە ببمە وشکەلقێک

پەلکی ئاخان بەسەر ئاخا بەردەمەوە

خۆڵەپۆکی ڕێگاکانی کوژانەوە

بەپێخوستی ئەم سەفەرە پەرکەمدارە

سەمای سێبووری ناگرن

چوار گەز کفن بوو بە ئاڵایەکی قاچاغ

بەپلیکانەی شەپۆلە مەییوەکانا هەڵگەڕاین

کردمانە مەندیلی کێوێک

شەودرەنگانێ

لەنێو گۆمی پرسەیەکی نیوەچڵا نقوممانکرد

لەسەرەتای داچۆڕانی ئەستێرەکانی دەریادا

کوژانەوەی چرا رەشکەی بەر رەشەبا

لەنوسینەوەی کوژانی چرکە هەڵایساوەکانی

کردم

دەبێ لەتەنیشت خۆمەوە

قەرەوێڵەیەکی بێ دۆشەك

گۆڕێکی تەریك

کفنێکی نەدوراو

بۆ پیشهاتێك گلدەمەوە

لە چرکە چەقیوەکانی دەرەوەی کات

مەگیرانی بەخوێنی ئەنگوستم دەکەم

دەرۆست نایەم

بێمەوەسەر سەکۆی بەزمەجاڕی تەمەن
چاوەکانم بەدوای ڕێچکە کاڵەکانی
وڵاتی شەراب و سەما ئاوییەکان
بەبنمیچی پێڵاوەکانم گرێدەم ئاسمانم لێ
بزردەبێ
من بێ شینایی ئاسمان و
بەسەرپشتا ڕاکشانی شەوانی سامالْ هەڵناکەم

سەرەنجام ئەو تونێڵەمان داخست
کە دەیبردینە بەهەشت و نەیدەهێنایینەوە
چەند ساڵان حەپسی دۆزەخبووم
حەرفە ئاڵۆزکاوەکانی سزام
بۆ نەبوونە وشەیەک و
دەستبەتالْ لێی وەدەرنرام
دۆزەخ ئەو کانیە بوو بەنەهەنگەکانی ناساندم
شەوان لە کەلێنی ددانەکانیا جۆلانەم دەکردو
نەخشەی ئایندەم دەکێشا
هەموو گوتتان بەخشندەیی ئاوا نابێ

بەڵام کردنەوەی درزێک لە خەمستانی دڵێکا
بەکێوی قافهەڵگەڕانە
کەچی هەرزوو لەسەفەری لێژاییەکان راهاتین و
ئەستێرەکانمان تەڵاقدا
ئەوەتا هەموومان بووینەتە دەرگەوانی
کافرستان و
ژوورەکانمان لێ یاساغە
بەقاچاغ لەکونی کلیلی دەرگا زیوینەکان
نۆرە بۆ ناردنەژوورەوەی دزەتەماشاکان دەگرین
پێمباشترە دیسان بگەڕێمەوە قووڵاییەکانی
جەنگەڵ و
لەگۆڕێکی لێنەدراوا نیشتەجێبم
نازانم سەربە کام نیشتمانی غەیب و
سووتاوی چ گوناهێکم
چەندین قەرنە
پەنجەم لەپەنجەی کچێکی زەماوەندە
لاچەپەکانیش
گیرنەبووە

# تەنوور

حەزم لەباوەشێکی پڕمیهرو
پیاسەیەک بە نیشتمانی خەوندابوو
شەڕ بەرپێنەی دایە بەرپێم
خاک... رەنگی ئەوانی گرتبوو
بۆنی ئەوانی لێدەهات
گوێی بۆ نزام هەڵنەخست و گەرمایی خۆی
پێنەبەخشیم
منداڵانە گەمەم بەو وردە ئەستێرانە دەکرد
کە لەپرچی شەوە درێژەکانم کردبوونەوە
شەوەکان بەخشندەتربوون
لە رنینی ئەستێرەکانیان نەکردم
من لەزمانی خۆم ناگەم هێماکانیش حاڵیم ناکەن
سەرم وابەسەر دەفتەری ئەم عومرە ناڕەحەتەم و
بەو دەستانەم کە پەنجەکانیان وەک سووژن و
بەو پەنجانەم کە نینۆکەکانیان وەک گوێزانن
گیرفانم لەو وردە کاغەزانە بەتاڵکرد
کە شیعرە تەواونەکراوەکانم تیا نووسیبوون

ئەوەتا خوێنی وشەکان بەدەستمەوە وشکنابن
خوێنم ڕشتووە من  خوێنی شیعر
ئەگەر خەیاڵ بۆشوێنێکی دیکەم نەبا
ئاسمان لێفەیەکی سپی سپیم پێدانەدا
زەلکاوێکی سێبووریم بۆ کەمۆنابێ
سەرمی تێدا بەسەر سەبری مۆمیابووما
لارکەمەوە

.

هەراسانبووم لەو سەفەرانەی کە ڕەنگی
سەفەریان لێ کاڵببۆوە
هەراسانبووم لەو شەڕانەی
کە ئاسەواری ئەوانە
پلووکەبەردی منداڵە قەڵاتییەکانی هەولێر
ڕێبوارانی شەقامی قەڵایان
لەپیاسە گێژەلووکەییەکانی خۆیان تاراندووە
قەڵا تەرمی زەمینێکی لەمێژەوە نێژراوە
منداڵەکان وەچەی بەجێماوی ئەون
لە باخچەکانی ئاسماندا
دڕکی گوڵە بزێوەکان بن نینۆکیانی هەڵدڕی

لەبەرنیگای چراڕەشکەیەکی خنکاودا
پشتێنی تاریکایی باخچەکانی ئاسمانم
بەکەمەری گەردوونەوە بینی
قەدی درەختەکان مەگیرانییان بە دووکەڵ
دەکردو
منیش شێتی ئەو سێوەلاسوورانە بووم
کە زاڵمانە سووقیان دەکردمەوە
لەیەکێک لەو کوڵانانەی راوەسێوم تیادەکردن
وێنەیەکی خۆم لەترس و دڵەڕاوکەیی داتاشی
لەچوارچێوەیەکی قۆپاو خستمە دواگیرفانی
ئەلبوومەکە
خۆم دایەبەر تیشکبارانی ئەو مانگەی
بەچرپە پێیگوتم سبەی دەڕۆم
نەکرا بڵێم تۆ لێرەبەو من ئەو هەوارە جێدێڵم
کە ماچی ژەهر و
سێبەری کابووس و
هەناسەی گەردەلوولە
نەکرا پێیبڵێم و رۆیشت... نەکرا
ئەم سەرەی من هێند جەنجاڵبوو

هەمووشتێ لە بیرکردنەوەمدا منداڵبوو
ئەو سپێدەی چاوەکانم لەبەربارانا هەڵهێنان
نیگاکانم لەگەڵ پرووشەکان وەرین
ئەو درەختانەی سێبەریان لێنەکردین
توورەبوون و خۆیان لەژێر کوکوختییەکانیش
راتەکاند
رۆحی منیش بە باڵفڕکە دانەوی
کەچەترە دووکەڵینەکەمان لێبوو بەهەورو
هەنگەکان تەنها چزووەکانیان پێبەخشین
دایکە سەرقژنەکانیش تەنها ئەو سروودانەیان
لەبیرما
کە بۆنی نانیان لێدەهات
لەپم خستە بەربارانی
نیگا نوورانییەکانی فاڵچیەکەو گوتی
نان لەو تەنوورانە نابرژێ کە ئاگری شەڕیان
تێدا

## گەمەیەك لەودیوی خەیاڵ

سەرانگرێی هەسارەیەکی نائاشناو
ماڵی خۆ ون .. تەمێکی کاڵ ژوورەکەمی
شاردۆتەوەو..جادوویێک من
ئەی شکستەیی ئەم دڵە حەسرەتگرو لاتەریکە
کوانێ دڵۆپە شەونمێ
بۆخۆم نا بۆ مەلەی خەیاڵ
ئەی سێبەری تیلمە هەورەکانی هەناسە
بەچی بزانم سێبەری درەخت وگوڵ قورس نین و
فەرشی فریزی ئەم جەستە پاکیزەییانە ناشێلن
خەیاڵی پەپوولە چەتوونەکان تەپترناکەن
نازانم ڕەنگی گوڵ چۆنەو هەڵهاتنی خۆر چ وەختە
ئەی قودرەتی ئەفسووناوی
پشت تەیمانی خەیاڵە تێکچڕژاوەکان
لەم زەمەنی ئاگاییەم

کێ

هەڵ شە

مەکێ

# جانتایەك
# پڕ لە بەتاڵی

سینەی سووتاوی برینپۆش دەمبەیتەوە کام
بەرایی
چنگیٚ خەڵووزی غەزرۆکە ئاودامانی برینەکان
ئەو جیٚگایەی کە نایبینم جوانە وەکو خەونی
کۆیلە
لەخەونە بەرمڵاکاندا
شانشینیٚکی دمۆر و ئەستیٚرەیەکی بەختکز
شایەتیمیان خستەسەر تەختیٚکی لمین
بەسەر شانی ترسە ترسناکەکانی سپیٚدەیەکی
بەجیٚماو
شکۆی ئاڵا دۆڕاوەکان
بەبای بەربووی ئەو دەمانە کەوتنە سەما
کە هەڵکڕانی مەڵاشووی توونیٚڵەکانیان دەکردە
ئاوازی شمشاڵە شەیتانیەکان
بەرزەخ لە چاوەکانمدا سنوورەکانی سەرابن

بێهوودە شوێنیان دەکەوم
ئێوارە تۆزاوییەکانی هەولێر
لەپشت هەنگاوەکانمەوە جێنامێنن
کلۆڵێکی رستکراوە ئەم سەفەرەساڵانگیرە
بەدیار چاڵی شوێنپێیکانی
بەختم دەخەمە بەردەرگای کتێبە رۆحانیەکان و
ئەلفوبێیەک ئەزبەردەکەم
ختووکەیەکی بەهەشتی دەستی راستیم
بۆهەڵدەبڕێ
سێبەری تاڵەوەریەکان
رەنگرشتەی ئەتڵسی ئەدگارە دڵمردەکانی
ئەمسەرو ئەوسەری مێژوون

لەگێژەنی تەمومژی رامانمدا
هەولێر سێبەرێکی کزی چرا وەرەمدارەکانە
شەوان دەینێژم و سپێدان دێتەوەلام
ژان پەراسووی پلیکانەکانی خارانددووە
قەڵا
ئاسمانێکت هەبوو نزیک

زەمینێک دوور

دوور وەک هەناسەی منداڵی و

دەفتەری خەتە شەڕەپشیلەییەکانی مێژوو

مێژوو پرسیارێکە تەرکیدەکەم

دەبمە هاوڕێی ئەستێرەیەکی ئاسمانی

حەوشەکەمان

وەک نەیزەکێک

دادەکشێمەوە سەر زەویی حەوشە

دونیایەک لە حەوشەکەمان و

حەوشەیەک لە هەولێر و

هەولێرێک لەسینگمدا جێدەکەمەوە

بەسەر تیشە بەردەکانی ئاگاییەکی وەڕسەوە

ڕێدەکەم و

هەمیشە جانتای پڕ لە بەتاڵیی خۆم لەسەرشانەو

لە هەڵدێرەوە بەرەو هەولێر

لە هەولێرەوە بەرەو هەڵدێر

سەفەری خۆم دوایی پێناهێنم و

دەمرم

## جەنگەکان
## دواییان نایە

لە نۆژەندا گەڕامەوە بەر ئولفەتی سیحری شەوان
شەوی داچۆڕانی مۆمی چاوەڕوانی
لەوێوە بە رەنگکردنی دیوارەکانی بەهەشت
تاڵێکم لە قژی سپیم رەشکردەوە
گۆرانیە نیوەچڵەکانی منداڵی و
خونچەی خەمی ئێوارە بێپیاسەکانم
بەسەر ئەمشان و ئەوشانما بۆ سەیران برد
سەیران وەک خەونی ژیکەڵەی منداڵان بوو لەوێدا
ئاسمان جۆلانەیەکی ئاواکرد
کریڤ رووبارێکی کردە برادەر
ژنەکەم کراسێکی لەگوڵ چنی
منیش منداڵبوومەوەو کاکۆڵم لەگیاگرت
سەیرانبوو
سەیرانی شەوی بەربزەی مانگ و تریقانەوەی
منداڵان
حەیرانبووین

لەسەیری رۆخ رووباری کریستاڵی و درەخت

وگوڵاڵان

ئەو گوڵاڵانەی

ئاویان لە کانی کەوسەرو

هەوایان هەناسەی باخی بەهەشتبوو

کە سەرمەستی ساتە سرووشدارەکان بووم

کاسەی رۆحم کەوتە بەر پەللاری ئەوان

یادت بەخێر کاسەی پێکراوی رۆحم

لەچەرخی هاودەمیتابوو

چۆڕچۆڕ خۆشاوی ئەڤینت

لەکانیلەی بەرسێبەری چنارەکان

دەخستە سەرلێوی شمشاڵژەنە دڵدارەکان

ئاوەڵاکەن

قەنتەرەی ئەو مرازانەی هێشتا کاڵن

رۆحم تامەزرۆی ختووکەی باڵەفڕکەی کۆترەکانە

سێبەرێک بەسەر تەنیاییم هەڵدەن

لەحیکمەتی بەستەدەستی و

کاتە کشاوەکان پڕبووم

## پڕاوپڕ

ئەم گەردوونە لەشەڕدا هەناسە دەدا

منیش بێهوودە

بەجوتێ چاوی ئەبلەق و

دوو ئەژنۆی شلەوە

لەچەقی شەڕەکانەوە

ئاگاییم دەدەمە دەستی خەیاڵێکی سەرمەستانە

بۆکوێ چوو رەنگی پەڕیوی روخساری مانگ

لەکوێ دێن ئەو هەورە شەهوەتبازانەی

باخچەی حەوشەکەم ناناسن

حەوشەی خۆم نا هی گۆڕەکەم

گۆڕی خۆم نا هی سێبەرم

سێبەری خۆم نا هی خەونم

خەونی خۆم نا هی...

نازانم خەونی کێ قەرزکەم و

ئەم شیعرەمی پێ تەواوکەم

* ئاسمان و کریف کچ و کوڕمن

# داڵغە

من نیم کە دەمەو ئێواران پیاسە بە
شەقامەکاندا دەکەم
گوڵی باخە بەهەشتیەکان بۆ یەخەی خۆم دەڕنم و
شەوەکان لەچراخانی پڕلە سەرمەستی جێدێڵم من نیم
ئەوە من نیم

لەسەر رێگاکانی سەفەر گوڵان دەشنێن
با گوڵێکیش لەسەر رێگاکانی چاوەڕوانییا
بخەندێ
گوڵی خوێن و دڵ و سێبەر
کامیان بۆ کامیان تەڵاقدەم

داگیرساندنی چرایەک رەنگی هەناسەیەک
دەمژێ
هەناسەکان سنوورەکان جێدێڵن و
سنوورەکانیش هەموومان

خوا لەچاوە نوورانیەکانی ئێمەوە
مەراقێکمان بەسەردا دەبەشێتەوە
کرمی ئەڤینێک لەسەرماندا دەبزوێ و
شەڕیش بەسەر چارەنووسمان باوێشکێک
هەڵناوەرێنێ
من لەززەتی تامە نەچەشتووەکانم لەرۆحی خۆم
هەڵدەمژم
ئەو رۆحەی رەنگەو رەنگیش نیە
بەرێکەوت جلەوی جەستەمی گرتبێتە دەست
ئەی رۆح بەسە ئیتر ببە بەخۆم
ئەی خۆم بەسە ئیتر مۆمێک بەچەتری سەرتکە
ئەی سەر تۆکە ڤایرۆسی شەڕو ئەڤینت لایە
گوناهێک کاڵناکەیتەوە
ئیتر من و تۆو ئاشنایی
چ مانایەکی بێمانا

## ڕەنگی ئێوارە

ئاسمان چەترێک بوو لە دەریا
روانین خەونێک بوو لەبیابان
درەختێک بەپێوە نەبوو
باڵندەیەک لەفڕین نا
شەڕەکان ڕەنگیان پەڕاندم
بهێڵە با ڕەنگێک لەتۆوە هەڵمژم
کە ڕەنگی تۆ ڕەنگی هەموو تاڵەکانی
پرچی ئایشەو فاتمانە

ئاسمان چەترێکە لە دەریا
روانین خەونێکە لە بیابان
ئێوارەیەک لەرەنگی من
رۆژنامەیەکی لوولدراو بەدەستەوە
سەر بەمەیخانەیەکدا دەکەم و
دوای شەومەستبوونێکی ڕەها
رۆژنامەکە لەناوپەلکە چەرەزو

ئێسکە رنراوەکانی سەر مێزەکە جێدەهێڵم
بەپیاسە دەگەڕێمەوەو
حەرفەکانی ئەڤین راڤە دەکەم
رەنگێکیتر
بۆ ماناکانی سرووتی
پەرجوویی رۆح کەمۆدەکەم

ئێوارەیەک لە رەنگی من
بێدەنگییەک لەرەنگی گوڵ
خاڵخاڵۆکەی لەپی زارۆیی دەخاتە
ژێر تەنکەپەردەی خەوەوە
چرپەیەکی شەرمن
هاواداری جوانیی وەرزی ئەفسووناویی
ئەودیوسنووری رامانی گۆشەگیری و
تەنیاییە سپییەکانە

مەستم بەتۆ
ئەی گۆرانییە نەگوتراوەکانی غوربەت
مەستم بەتۆش

ئەی ڕێواسە مزرەکانی

ژێر بەفری خەمی ئاینده

مەستم مەست

بمبەنەوە بۆ بەر ڕێژنەی ماچەکانی پەپوولەوگوڵ

سڵاو گوڵە کریستاڵیەکانی ئێوارە

سڵاو لە ئێوەش ئێوارەکانی پشکووتن

کەهەر ڕۆژە کتێبێکم پێشکەش دەکەن

لاپەڕەکانی پڕن لە سیحری جوانی

دێرەکانی بالیفۆکەو

وشەکانیشی پەپوولەن

پڕن لەجوانیی پەنجەرە

ئەو پەنجەرە کراوانەی

بەسەر باخاندا دەڕوانن

ئەو باخانەی پڕن لە گوڵ

پڕن لە ڕەنگی ئێوارە

پڕن لە خولیاکانی من

## بەیادی من جارجار بخوری ئاگردەن

چرایەک هەڵکەین و

شیعرێک بۆ شەوچەرەی ئەم دەیجوورە

داگیرسێنین

کتێبێک بخوێنینەوە

باسی هەقایەتەکانی عەشق و

گەمەکانی عاشق بکا

سێبەرێک بۆ خوێنە بزێوەکانی برینی جە ستەی

ئەمرۆو

کێلێکی نەنووسراو بۆ گۆڕی ئەو رۆژانەی مردن و

لە گیرفانیاندا ناسنامەیەک و

لە سەرتاپای لەشیاندا

نیشانەیەک چرپەیان نەداین

بەر لە هەموو ئەمانەو دواتریش

چرایەک هەڵکەین و شیعرێک داگیرسێنین

چرایەک هەڵکەین و گۆرانیەک هەڵفرێنین

چرایەک هەڵکەین و

منێک لە تەماشای تیشک بچنین

من کە تۆمەتبارم بەو تەماشا قاچاغانەی

بێ روخسەت و خواحافیزی

لەچاوانمەوە فڕین و

بێ روخسەت و بەبێ سڵاو

لەسەر سواندەی ئەستێرە نەڕنراوەکانەوە

هەڵنیشتنەوە

لەسەرمە عومرێکی دیکەش بۆ سزا تێهەڵبچمەوە

وەرزێک لەگومان بەسەرچوو

وەنەوزێک بەدوایا نەهات

خەونێک هەڵدێراو کەرتکبوو

نە- خراییە گۆڕێکەوەو

نە- لافیتەیەکی رەشیشیان بۆی هەڵواسی

کاڵبوومەوە تاکڵوکۆی ئاسەواریشم دامرکا

لە نەبووندا

دەستم خستە نێو دەستی خۆم

پەنجەم نایە پەنجەی بارانێکی نەڕژاو

چاوم بڕیە تاریکاییەکی بەفرین

لەنەبووندا

کۆڵانێکم لەسەر شەقامێکی بەهەشت کردەوە

ماڵێکم لە کۆڵانی کورتەپیاسەکانم دانا

ژوورێکم لە ماڵەکەم چۆڵکرد بۆ تەنیایی

نەمزانی تەنیایی وەک خوا

لەم دونیادا

لەگەڵ بەندەی خۆشەویستی خۆی هەڵناکا

نەمزانی تەنیایی وەک با

لە ژوورێکی بێ پەنجەرەو بێ دیوارا جێمدەهێڵێ

دەبێ بەدوایدا راکەم و

بەسەر گۆڕە لاتەریک و دوورەکانا بمبەشێتەوە

ئەو گۆڕانەی

سەردەمێک کێڵگەی حاجیلەو

ئێستاش مەیتخانەی سەرمن

مادام تۆمەتی من دزەی تەماشاکانمە

بۆنیشتمانی ئەستێران

بێحورمەتیم کرد بەرامبەر بە سنوورو

سنوورمەندان

لەسەرمە عومرێکی دیکەش بۆ سزا تێهەڵبچمەوە

# سێو

تامی سێوم لەدەم خۆشە
کرمەی سێو لەبن ددانما
وەک مەستیەکی رەها تێرم دەکا

سێو
ئەگەر لەبن کراسێکی بەتاڵی کچانەشبێ
پێی شاگەشکە دەبم

سێو
جوانترە لەمانگەشەو و
خۆشترە لە کۆکتێلی چێژەکان

کە بەرەورووی سەبەتەیەک سێو دەبمەوە
لە بەهەشتێک حەپسدەبم
حەپسبوون لەناو سێواندا

چرکەیەکی تاقانەیە
ئەڤین تێیدا دەبێ بە سنوورەکانی ترس و
جوانی بە رەشنووسی رۆمانە کورتیلەکانی
عەشق

سێو
ئادەم ناهەق نەبوو خواردی
من هەقی خۆمە شەیداییم
سێو...بەهەشتێکی لەدەستدام
سێو...بەهەشتێکی لەدەستنام

سێو

## هەڵەبجە

سەدان لاپەڕەی لەسەر نوسراو

هەزارانی تریش

هەموویان زێدەگۆیین

هەڵەبجە

تەرمێکە واق وڕماو

لەخۆی نەبێ لە هیچ ناچێ

## تەنیاییەك لەخۆی دەچێ

ئەم دەلاقە بچکۆلەیەش بەسەر تەنیاییتا داخە

تا ئەوپەڕی بێهوودەیی بدوێ

بێدەنگبە هەتا ئەمپەڕی بێهوودەیی

ئیتر بەم زمانە جارانییە

ئەم مەتەڵی ژیانە ناخوێنرێتەوە

دەستی ئەم تەنیاییە بگرەو

بەکۆڵانە سیحراوییەکانی ئەوێدا پیاسەیەکی

دووقۆڵی بکەن

لەگەڵ تۆمە ئەی من

ئەوە بۆچی هەرهیچ نەبێ سەرێکم بۆ نالەقێنی

هەرهیچ نەبێ - نا — یەکم بەڕوودا نادەی

هەرهیچ نەبێ چاوێکم لەگەڵ خۆت نابەی

تا لەتەزووی لەززەتی تەماشاکانی

تریفەی مانگ و بارینی نەیزەکەکان بێبەش نەبم

ئەویٚ وڵاتێکی خۆشەو من نایگەمیٚ

دەستی ئەم تەنیاییە بگرەو برۆ

چاوێک.. گوێچکەیەک.. لوتێکم ببەو برۆ

وا درەختەکە وشکبوو

گەڵاو کەنارییەکان فڕین

سیحری جوانییەکان بەتاڵبوو

ئیتر بەدیار چیەوە ڕامێنین

کە ئەم دەلاقە بچکۆلەش بەسەر تەنیاییت

دانەخەی

ئیتر چی...!

## شەهید

چرکەکانیش لە بێزاری خۆیان وەڕسبوون

هیشتا دەستم لەسەر دڵی داخورپاوی ساڵەکانا

مناڵێکی دڕناگەگرتووی گرینۆکبوو

هەر گیرفانێکم کلیلێکم تیا ناشت

بە هەوپای کۆمەڵێ دەرگا

قەڵایەکم لە تەرمی شەو

لەسەر سینگە ئیسفەنجیەکەی خۆم هەڵنا

ڕۆژەکان بوون بەساڵ .. بەسەدە

سەدەکان بوون بە زەنگیانەیەکی وردی

تەزبیحێکی درشت

کە چراکە کوژایەوە سەرابێك پەلکێشیکردم

ئەودنیابوو پرتەقاڵێکم تیا رنی

کەرتێکم خواردو ئەویدیم

لە حەوشەیەکی قوڕی گەڕەکێکی پەڕگەی شار

ناشت

زیندەخەونێ تادێ درێژتر دەبێتەوە

تیلمەکانیم بۆناکرێتە کراسێک و
پێستی پاکیزەیم لە گەردیلە شێدارەکانی
ئەم دونیایە تخووبەندکا
دەزانم ددانیکی کەوتووی
خەونی شەوی پێشووترم
هاتووم خۆم لە دەفتەرەکانتان ناونووسکەم
کەزانیتان
باراشی ئاشی دەمتان ناهاڕم و
مۆزەخانەش غەریبێکی دەستبەسەرە
دەفتەرەکانتان کلیلداو
کلیلەکانتان لێ دزیم

## ئێرە باشترین جێگایە
## بۆ چاوەڕوانی

دەقیقەیەك زۆرە

چرکەیەکیش هەروەها

ژیان هەمووی چەند دەقیقەو چرکەیەکە

مردنیش هەروەها

ژیان چرکەیەکە

تەنها یەك چرکە

لە مردنا تێیدەگەین و

دەزانین هیچە

مردنیش چرکە

یان بەشێك لە چرکەیەکە

تەنها لە ژیاندا تەختێکی شاهانەی بۆ چۆڵ دەکەین

ژیان بە مردنیشەوە تەنها چرکەیەکە

رەنگە کەمتریش

بەڵام من لێرە

سەعاتێك دەبەخشم بە چاوەڕوانی

سەعاتێكو پتریش

## یانسیب

بەبندانەوەی برینی ساڵانی چاخی بەردین
حیکایەتی ئەفسوناوی چرکە سەدەبیەکانی تەمەنە
شەوان لەخەونەکانمان دەیبینین
خەون رۆمانێکی درێژە
پچڕ پچڕ دەیخوێنمەوە
تەمەنم چیرۆکێکە کورت
قەدەر دەیخوێنێتەوەو فرێیدەدا
من مرۆڤێکی گوناه و
گوناهبارێکی ناقۆڵاو کەسنەدیتەم
شەیتانی بوونی ئاوەزم
رشانەوەی سەر مێزی شەوانمە
تەنهام و
گوناهی خۆم بەو نوێژانە دەسڕمەوە
کەس نایانبینێت و
لەسەر بەرماڵەکەمەوە کەس نابینم
ئەی بوونی خۆم لێت تێناگەم

لە رامانما

نائاگایی مارە دەکەم

تۆش وەک دایکی منداڵەکەم زویر دەبی و

بەنقورچێ خۆتم وەبیردێنیتەوە

بۆشاییەکان دەخوێنمەوە

تۆ لەجەمسەری نێوانیان

بەرپێنە دمدەیتە بەرپێی روانینەکان

پەنجەکانم تەرمی زیندوون

لەو دونیا هاتوونەتەوە

لە سۆراخی کێ بپرسم

لە سەنگەری کێ دابەزم

ئەوەتام سەنگەرم لەخۆم گرتووە

خوێنی خۆم حەڵاڵ کردووە

هەموو شتێ لەمنەوە دەستپێدەکا

دەستپێکردن یانسیبە

ساڵانێکە دەستم بەڕاکێشانی کردووە

دوورنیە لەم یانسیببازییەمدا

پەڕۆیەکی رەشم بۆ دەرچێ

وەك ئەو پەڕۆ ڕەشانەی

لەسەر دیوارەکانی شار و

سوچی تەلەفزیۆن و

شانی ڕۆژنامە و

بەردەرگای هەمیشە کراوەی مزگەوتەکان

دەدڕێن

پەڕۆی ڕەش مۆدەیە

مۆدەی سەردەمی ئاشتی و

دەسکەوتی مێژووییە

بەلەمێکی بێ سەوڵە

مرۆ دەباتە ناو

کەفی وشەو

هیچایەتی و

میچایەتی

## هەڵبزڕكان

باوەشێنی درەختە دۆزەخییەكان و
هاڵاوی بەفرە پیرۆنەكان
لاوكێ دەچنن ناچیتە گوێوە
ملكەچی غەیبین و بەخشندەییی بەسەرمانا
هەڵنادا
چاوساغیی دەنكەلمەكانی چاومان
بەڕێگا نادیارەكانمان دەبەستێتەوە
پەڕەمووچی پەنجەی راستی دەستی چەپی
هەریەكێكمان
تابلۆی ترس بۆئەویدیكە رەنگدەكا
گومان تادێ باڵاترو
سێبەرمان تادێ درێژتر و
چاومان تەڕ و
هەوری چاوەڕوانیمان تینووتر
هەناسەی تۆزوبا
لە پارزونگی دڕاو دەستنوێژی بۆ هەڵناگیرێ

چراکان کزدەبن و

کزتر و

ناکوژێنەوە

کانیەکان لە تینوویێتیا شەلال دەبن و

شەلالتر و چکناکەن

تارماییەکی چوارشانە

سێبەری خۆی دەمامکداوە

هێمنتر لە رەشەبا

فێنکتر لە زریان

لە درزی دیوارەکانەوە دێ

ماچی یەهودا دێنێت و

بە تابووتی پڕ خەونەوە دەڕواتەوە

چوارچێوە بێ دەرگاکان و

دەرگا کڵۆمدراوەکانیش رادەخا

خەونەکان هەڵدەبزرکێن و

ماچەکان وشکدەبن و

خۆناگرن و

دەکەونە خوارەوە

پشیەکم بەتەڕایی برینەکان خۆشە

## نوسینەوەی بۆشاییەکانی گیان

باڵندە بێ ئاسمانەکان

لەسەر چلی درەختە بێ وەرزەکان

گرمۆڵەبووی ساتمە نهێنیەکانی بوونن

لەژێر پێستی هزرە راستوچەپەکانی تاریکستان

چرایەک فوو لەخۆی دەکا

شەمشەمەکوێرەیەک چرایەک دادەگیرسێنێ

دوو ستوونە دووکەڵ

دوو گەردەلوولن

بەگەرمێنی چاوە مۆلەقیەکاندا دەخشن

فریزی برژانگان دەڕنن

ئاوێنەی چاوان لەگەردی مێژوو دەگرن

مێژوو ئاوێنەیەکی رووچاڵی گەردەلوولە

بەیانیان بەسەر پێدەشتی خەونەکانا هەڵدەکا

ئێواران لەگۆڕستان دەگەڕێتەوە

پێش ئەوەی مێزەکەی بڕازێنێتەوە

سەرێك لەماڵتۆس دەدات

ماڵتۆسی شاگەشکە باوەشی پیا دەکات

لە مرچە مرچی ماچان

پەپوولەو گوڵ و باڵندەو

کانیەکانیش زریکەیان لێهەڵدەستێ

باڵندە بێ ئاسمانەکان

لەسەر چلی درەختە بێ وەرزەکان

دەنیشنەوەو..نانیشنەوە

نە تووکیان ماوە

نە گەڵای درەختان

دایانپۆشێ

بریا ئێستا لەنێو خەونەکانیان بوومایە

## گومان

لەکوێی نەخشەی خەونەکانما گەراتان داناوە

دەنگتان هەڵدەلووشم و بێدەنگیتان راومدەنێ

هەڵدێم و ساتمە لەرۆحی کەوتووی خۆم دەکەم

بەسەر پەراسووی شکاوی بستەخاکێکا دەکەوم

لەسێبەریشم بێزارە..رەنگم بەئاو دەسپێرم

پەنجەکانم بە خۆڵەمێشی وێرانەیەکی خەواڵوو

چیتر نابمەوە خۆم

ئێوەش ئەم سێبەرە ئاچووفەی خۆتان

لەسەر تەرمی بزۆزم بسڕنەوە

من دەمێکە هیلاکی خۆم داوەتە بەر پرووشەی

ئازارە مێخۆشەکانی برینێکی شلەتێن

ئێرەیی بەبا دەبەم

بێباکانە بناگوێی سنوورچیەکان دەسمێ و

منیش بەدیار تەرمی غەزریوی خۆمەوە

ساتەکان دەکەمە رۆژو لەپەنا هەر چرکەیەکیا

سێرە دەگرمە تارمایی پیرۆزییە تەڵخەکان و

پەنجەم لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگە سوارەکەم

توندتر دەکەم..رێژنەیەك

پشتم تێدەکا..چروکستان وڵاتێکە

لەنێو خوێنی شەری نێوان پەنجەی من و

پەلاپیتکەی تفەنگەکەم رەشداگەڕاوە

رەش وەك ئەو شەوەی

سەرگەرمی سەفەرە ئاوییەکەی خۆم بووم

کاتیٚ ئاسمان بووە لێفەیەکی مۆرو

ئەستێرەکانیش قاپیلکە برنجێی رژاو

کە دەریا بەخۆی دادا

دەنکە برنجەکان بوونە ماسی

بەدوایاندا تەمەنی خۆم خستە کۆڵی

تەنکە هەڵمێکی هەڵکشاو

ئێستاش ئاسمان دیوارێکی نوستووە

باڵندە پشتی خۆیانی پێدەخورێنن

تەرمی کونکونی باڵندە

بالیفی برۆ کەرتکەرتەکانی چاوەڕوانییە

بەشاهێدی بورانەوەی چراکان و

رەشتر هەلگەڕانی گوناه

ئەشقیای هەڵەتەکانی

نێو دڵۆپە ئاوێکی ژاراوی بووم

فرمێسکی چۆڕچۆڕی خواوەند

رژایە سەر ئەو هێلکە بەردانەی

لافی کچێنی خۆیان دەکردە مەرەکەبی ئەو

قەڵەمە درۆزنانەی

کرێگرتەی دەفتەرداری مێژوو بوون

ترووکاندیان و

وەچەکانیان چ بوون خوایە

چی بگێڕمەوە ..کێ باوەڕم پێدەکا

ویستم بەچاوی ریپۆقاوی شیعرێکەوە بیانبینم و

بەگوێی قورسی گۆرانییەکی قاچاغەوە

بیانخوێنمەوە وەچە بەردینەکان

گیانێکی نیگەرانیان خستە جەستەیەکی شەکەتی

تیاچێنراوەوە

بێئەوەی پرسم پێبکەن

من بم یا نەبم

گوتیان ئەوە تۆی

هەتا مردن گومان لە منایەتی خۆم دەکەم

# پەرژین

چرپینی لاوکی تەنیایی
باڵەفرکەی مەلی باڵشکستەی رۆح و
کوێربوونی چاوی ئەستێرەیەکی سەرمەستە
کتومت پێکەنینی کچانەیەو
لە درەختی هزری منیان تاراندووە

پیاسە بەسەر تەختاییەکانی دۆزەخدا
دۆزینەوەی چرکەیەکی بزربووە
چەند سەدەیە بەدوامەوە تەکاندەدا

سێبەر شەقامی گەردگرتووی
شارێکی هەناسەتەنگ و
عومریکی درێژە لە وەرسی
تارمایی جەستەم لەبنیا رووبارێکی هەڵەتەیە
لە هەورگیری ئاسمان و
هەڵزنانی مێروولەکانی شەڕ

بەدیوارەکانی ناوەوەی سەرما

ناچارم خۆم لە فوارەی گومان بگرم

خاك

تەنکترین رایەخ و

بێدەسەڵاتترین دایك

لەژێر توێژاڵی رشانەوەی ئەژدیهادا متبوو

وەرزێك بوو

میوەی بەهەشت بێتاموبۆو

رەنگەکانی بەهار مردوو

من و شەڕێکی نەبڕاوەی دەرەوەو ناوەوەی

کاتە مارەبڕەکانی خەیاڵ

ژن و مێردێکی چەند تەباین

کات چەترێکەو

بەسەر سەرمان ناکرێتەوە

نازانم چ شەوێك پیلی کاتژمێرەکەم دادەگرم

موعجیزەیەك لە یەزدان دەخوازم

خیانەتی کاتژمێرو

زێتر ئاوسانی دەبدەبەی تەنیاییم

ترسێکە لەگەنێ مس و

تەشتێ ئاو لێمی دەرناکەن

تینوویێتیم بەئاوی حەیاتیش ناشکێ

منی ماری ڕۆژانگەستەو کەسەرکوشتە

خۆم بەلقی بڕاوەی درەختێ

دونیادیدەو پەراسووشل هەڵدەواسم

چواردەوریم پەرژین کردبێ

گەر ئەستێرەکان قژیان بۆ ڕنیم

هاواری خاك لەسوێم هەراسانیکردن

ڕێز لەمەرگی هەڵبژاردەو

پەرژین بگرن

## بیگۆڕ

شەو گۆڕێکی بۆ کچێنی خۆی هەڵکەندو
بەدیار سەرابە سەرابیەکانەوە
لە قاقای پێکەنینیدا
تاریکی هەتیو مایەوەو بوو بەهەڵم
پاشەوپاش راکەڕاکی مێژوو دوایی نایێ
چاوەڕوانیمان بەدیار خەونە دارینەکانەوە
شەوچەرەی شەوارەیەکی ئەزەلی و
دەفتەرێکی نەنووسراوی چارەنووسە

ئەستۆی کێ
راستکردنەوەی هەڵەی دروستبوون هەڵدەگرێ
کاتژمێر
هزرم لە قوتووێکی داخراو دەئاخنێ و
تەنێ چاوەکانم دەبا
لەپشت ساوایی بوونەوە دەوەستم

هەموو ڕێگاکان دێنەوەلام
دەچمە بیابانی فرمێسک و
لەگەڵ دەنکەلمەکانا خۆمان دەشۆین
دەچمە بۆشاییەکانەوەو
لەگەڵ ئەستێرەیەکی تەریک
قەوارەیەک بەقەد خۆمان داگیردەکەین

سەفەر دەمامکێکە دەیبەستم
دەمامکێکە فڕێیدەدەم
لەم ناوەندەدا
منایەتی دەڕوێ
منایەتی دەمرێ
ئەوەی دەمێنێتەوە تەرمێکە
پسوولەی چوونەژوورەوەی
هیچ گۆڕستانێکی پێ نیە

## سەرمەستبوون لە بێدەنگیدا

تۆخایی هێڵە چەماوەکانی گومان

لەچاوانما تانەیەکی هەڵواسراوە

لە پەیوەندی نێوان من و گومان و گەشت

شتێکم بۆ نەمایەوە

ناچار..وەرزێکم لەناو کراسێکی نیوقوڵا جێهێشت

بۆ ئەم یەڵدایە وەرزەوان گەڵاوگوڵی زۆزانێکم

پێببەخشە

خەمی ساڵانێکم لەگەڵ گۆرانییەکی خەمینا

هەڵمشت

بۆ ساڵی دادێم پەلوپۆی جەنگەڵێکم بەسەرداکەن

خەونێک ڕێنماییم دەکا

دڵی ئەم خەونەم پێناشکێ

پەنجەکانم لەناو گوڵدانێ بڕوێنن

باچێتر خەومان بە قیرەی پیتە مردارەکانی

تاریکیەوە نەزرێ

پەنجەکانم داگیرسێنن

لەدنیایەکی وشک و
گوڵزارێک لە برینی تەڕ

ئێستاش نازانم ئەو ڕێیەی نەمدۆزیەوە بۆ کوێ
دەچوو
بەڵام ئەفسووس نەمدۆزیەوە
لە گەڕانما
مەتەڵێک مامۆستای ماتماتیک و
قورئانێک مامۆستای ئاین پێشکەشیانکردم
هەردووکیان گوتیان ڕاستی بڵێ و درۆ مەکە

پەنجەکانم لەناو گوڵدانێ بڕوێنن
با گرێیەک لە مەتەڵێک بکرێتەوە
پەنجەکانم داگیرسێنن
با سوورەتێک بۆ عەشق بخوێنرێتەوە

ئێستاش نازانم ئەو ڕێیەی نەمدۆزیەوە بۆ کوێ
دەچوو
بەڵام ئەفسووس نەمدۆزیەوە
لە خەیاڵما
ڕۆژانێ هاتن وتێنەپەڕین
خەفەت گوڵی پێدەرکردن
گوڵە حاجیلەکانی بەفرو
گوڵە سووورباوەکانی برین
لە برینداا بێدەنگبووین و
ئەڤیندارانە شەڕە ڕۆحانییەکانمان داگیرساند
لە بێدەنگیدا سرووتێک سەری مەستکردم
وەرن با شتێ لە مەستیی ئەم سەرەی خۆمتان
پێبەخشم
سرووتێ سەری مەستکردووم
تۆش وەرەو سەرمەستترمکە

## بۆ تۆ ئەی مەرگ

شەوت باش ئەی خواوەندی خەو

من هاتووم بۆ لایلایەیەک

سپێدەت باش ئەی کازیوە

من هاتووم بۆ چەهچەهەیەک

مردنت باش ئەی عاشق

من هاتووم بۆ گلکۆیەکی بێ کێل

منت باش ئەی مەرگ

کە تائێستا وشەیەکم نیە بۆ تۆ

خەریکە ئەو سەفەرانە لە یادەوەریمدا

دەسڕێنەوە

کە لەتەک هەمیشەبەهارەکاندا

بۆ وڵاتی ئەم باخچەو ئەویتر دەچووین

ریتمی رەنگەکانی سروشت

لەخاوبوونەوەی ماسوولکەچێژئاشناکان

خاودەبنەوە

سڵاو ..گوڵەکانی ماچ و کانیلەکانی چێژ

سڵاو .. خەونەکانی سەراب و پیاسەکانی یاد

من عومری خۆم بەڕەونەقی دیدارە

تەریفەکانتان بەخشی

ئەو دیدارانەی هەرجارەی

ناوێکیتر بۆهەنگاوەکانم دەبیننەوە

ئێستا من فەرهەنگێکم لە پەیڤ و
تۆمارێکم لە سەفەر
کە هەر هەموویان لە بالکۆنی یەئسەوە
بەسەر برینەکانی خۆمەوە دەڕوانن
برین..برین..برین
من فرچکم بە برین گرتووەو
ناسنامەم برینە
گوڵەکانی بەرۆکیشم لە برینن
سەفەرەکانیش شوێن برینەکانیان نەسڕیەوە
ئەوێستا ئەم شانەم پڕە لەسەفەرو
ئەویدیم پڕە لە برین
بەم دووبارە قورس قورسەمەوە رێدەکەم
رێدەکەم و
رووم لە سەراب و
پشتم لە سەراب و
فەرشی بەرپێم سەراب و
مێژووم سەراب و
خەونم سەراب

## نوور

عەشقە سەری سپیکردووم و ناهێڵێ بمرم

عەشقە دڵی سپیکردووم و ناهێڵێ رەنگێکیتر

لەدڵبگرم

کەسێک لەبەر مەمکانەوە گۆرانیەک دەڵێ و

دەمرێ

کەسێک بەسەر گۆچانەوە

دڵۆپێک ئاو

- تەنها یەک دڵۆپ - خەونێتی

لەنێوانی مەمکەمژێ و راوەئاوا پەرتدەبم و

تەنها عەشقە بۆی هەیە خڕمکاتەوە

ئەی لە هەتاو جوانتر.. عەشق

سێبەری خۆتم بەسەردا حەرام مەکە

باهەمیشە لە نیعمەتی نەمریدا جوانتر ببم

حەزدەکەم کە بزردەبم تەنها تۆ بمدۆزیتەوە

بمدۆزیتەوەو بمدەیتەوە دەستی خۆم

حەزدەکەم کەبزردەبم تەنها تۆ دەستم بگریت و

وەک هەمیشە لەحەوزی خۆتم هەڵکێشی

حەزدەکەم لەئاگری خۆتا بمکەیتە قەقنەس

رێنماییم بکەی تا نووری ئەو ئاگرە بگەیەنمە

هەمووئەو دڵانەی  تاریک تاریک تاریکن

هەر بەو نوورەش ئەوچاوانە بکەمەوە

کە هەمیشە غوباری رۆژان دایخستوون

## کۆتایی

بەسەر پردی بەرپێنەدا رێدەکەین
لەسەر کۆڵەگەی لم
کەپرۆکەی خەون چێدەکەین
تێکئاڵانی هەنگاوەکان
بەشوێنیا
ساتمەیێ
کەوتنێ
گیاندانێ
تی چاوێکی نیوە بینا
تاتەشۆرو دەسرازە
لەپشت تەمی نهێنییەکان بزر دەکا
مێژووی دەستکرد را دەبێت و .. هەقیقەتیش
لە نێوانیان دەنووین
منداڵێکی تا ئێستا لەدایک نەبوو
دوایساڵانێ
کۆتایی چیرۆکەکە دەنووسێ

# ڕەنگ

هەمیشە بە ڕەنگ دەستپێدەکەم

وەک ئەوەی لە هەموو ڕەنگەکانی دونیا

ڕەنگێکم نەبێ

کە دەزانم شینایی ئاسمان هی منە

بڵقە سپیەکانی باران و

ڕەشایی پرچی یارو

زەردایی خۆرەتاو و

خەونە سەوز سەوزەکانی بەرەبەیان هی منن

خوێنێکی سوور سووریشم هەیە

بەبێدەنگی دەست بە ڕەنگەکانمەوە دەگرم

نەبا کاڵببنەوەو

لە بێڕەنگیا بمرم

## شتێکی وەک شیعر

پێیەکانی وەک مارەزیوی بوون گالیسکەکە
سەندووقێک پەتاتە
بەسەر عارەبانەیەکی پەنچەرەوە
درەنگتر لە چاوەڕوانی مردن
لەبەر چاوەکانم بزر دەبێ
یەکەم کۆستەر
تاخمیك قەنەفەی نیوە سەربەرەوخولر
دووەم کۆستەر
چەند گونیەیەک کەنازانم چیان تیابوو
سێیەم کۆستەر
دوو..سێ نەفەری قاچاغ و
چاومڕوانیەکی بێهوودەی
پێبەستەی کاتژمێرێکی لەخەوماو
تێپەڕینی دوو..سێ کچی جوان و
باوەشێنی تکەفرۆش و
پڵخەپڵخی شاگردە مەسیحیەکان و

تەنیایی من
هەناسەی کۆتایی نەوەتەکان دەدەینەوەو
پیرەدۆجی ساڵانی شەست
لەپشت شووشەی پەنجەرەکە
گڵۆپە قوڕاویەکانی
بە تفە پغدارەکانی شوفێر پاکنابنەوە
ئاخ..ئەو رۆژانەی رۆیشتن و
یادگاریەکی جوانتان جێنەهێشت
خەتای خۆمبوو
تەمەنێکی دوورو درێژم پێتانبەخشی
ئیستاش لێرەوە
لەسەر یەکەم دێری ئاچووغی
ئەم دەفتەرە بەتاڵەو
لە سەرە کەچەڵەکەی کانەبی و
قرڕڕڕەی هەڵدانەوەی نابەدڵی دوکانەکەی و
پایسکلە دووقەفەزیەکەی
نۆکفرۆشەکەی مەعمیلمان و
تێپەڕینی ناسکەکچەکانی پەیمانگای مامۆستایان و
هاتوچۆی ئەو برادەرانەی

که من له‌پشت شووشه‌به‌نده تاریکه‌کان
ناناسنه‌وه... ده‌ستپێده‌که‌م
راوه‌سته  رێبواره سه‌رلێشێواوه‌که‌ی
من نه‌بێ که‌س نازانێ پرسیاری کوێده‌که‌ی
راوه‌سته..را
من لێره‌وه‌کۆنترۆڵی جووله‌ی
مێشووله‌و
مرۆڤ و
با و
کۆسته‌ره‌کانی مه‌ریخ و
پاپۆره‌کانی جه‌زیره‌و
ترێله‌کانی ئه‌رزاق و
هه‌موو شتێکی دیش
ده‌که‌م
من منم و
ئێوه‌ش ئێوه‌ن و
ته‌وووواااالو
ئه‌ی رۆژه‌کانی ژێر گۆره بێ کێله‌کان

## دەفتەری کاڵبوونەوە

چیتر لە گوناهەکانی خۆم خۆشنابم
ئەی پڕگوناهترین نزای هەڵکشاو
زیزمەبە لێم
کە سەربوردەی دنیا دەخەمە نێو بوخچەی
کڵۆمدراوی شەڕەکان
چیتر لە گوناهەکانی تۆ خۆشنابم
کە ئەم لێوانەت پڕکردم
لەو گۆرانیە ناسازانەی ناوێرم بۆ کەسیان بڵێم
ئەوەتام وەک چەترە هەورینەیەکی تار
بەسەر رەنگە کاڵەکانی مەرگا پەرتبوومەوە
نسێی پەیڤێک داڵدەی نەدام
پەلەهەورێک داینەپۆشیم
ئەوێستاش .. پەنجەرەی سەرکۆڵانەکان
داخراون
گوزەری ئەو ریشۆڵانەی

بێهوودە دێن و دەڕۆن
شتێکم لا جێناهێڵن
سوپاس ئێوارەی تەنیاییم
لەم ساتە بکوژانەدا چەتری خەونێکت بۆ هەڵدام
چەتری خەونێکی عومر کورت
گوتم وەرەو تۆ نەهاتی
ناچار دیسان
لە کۆڵانە تاریکەکانی چێژەوە گەڕامەوە
هێندەی گوتم ئەی نیشتمان داڵدەمبدەو
چەندێک لە جوانیەکانی خۆت بتکێنە
چاوەکانمەوە
دەزانم ئەم نیشتمانە پرسەخانەی سۆزەکانەو
ئەلفوبێی وەرزیلەکانم
ناخاتە نێو دەفتەری یادەوەریەکان
ئەوەتا وەرینی وشە
وەرینی
ماچ و
هەناسەو
تەمەن

چەشنی گەڵای پاشپایزە

پەیکەری داڕوتاوم جێدێڵن

ئیتر چیمە لە پەیکەرێ

مشتێ خوێنی تیا نەگەڕێو

هەناسەیەک نەپرژێنێ

گوتم وەرەو با عومرت لەمەش کورتتر بێ

تۆ نەهاتی و ناچار دیسان

بەسەر رەنگە کاڵەکانی مەرگا کاڵبوومەوە

ناچار دیسان

لە کۆڵانە تاریکەکانی چێژەوە گەڕامەوە

بەرەو تۆ .. ئەی سەرزەمینی یادەکان..بەرەو تۆ

بێ بە فریامەوەو چیتر

چارەنووسم مەدەرە دەست رەنگەکانی ئەم

رۆژگارەو

بمبەرەوە قووڵاییەکانی خۆتەوە

لێرە ئیتر

بەدگومانم لە بێدەخلی پەپوولەکان

سەرگەشتە دەگەڕێم بەدوای وشەیەک

کە هەمیشە بەسەر زمانەوە هەڵدەپروکێ

وشەیەک بەژنی لەکەفە و

چاوی لە خۆڵەمێش

هەڵدەکشێت و من دادەچم

بەرەو شوێنێک کە شوێن نیە

هەڵدەچێت و من دەخەنم

وەک ئەوانەی لەمردن دەترسن و

تەکان دەدەنەخۆیان تا هاناسەیەکیتر هەڵمژن

ئاورێک و نیونیگای ماندوو

خەیاڵم بەسەر رۆژان دەرژێنیٚ

خەیاڵم دەرژیٚ ...خەونم دەوەریٚ

دەگەرێمەوە خەڵوەتی شیعرو وشەم لێدەتکیٚ

پێمنایە سنووری تۆوە ئەی سەرزەمینی یادەکان

وا دەشرۆم و لەم نێوانە بێمانایە

ختووکەیەکت پێنەبەخشیم و

تالٚ تالٚ عومرت پێوەراندم

بە رەنگێکی بێرەنگەوە

سەرم خستۆتە سەرلەپی بێئومێدی و

مۆلەق بەرەو دوور دەروانم

ئەم ئێوارەیەش دادێت و
شەڕێکی خنکاو لە چاوەڕوانی
ئەم ئێوارەیەش دادێت و
مەرگێکی دیکەی خەونەکان
ئەم ئێوارەیەو
من و
تەنیایی و
تەرمێکی دیکە
یەکتر بە رەهایی بۆشاییەکان دەسپێرین
جەستەی داڕوشاوی یەکتر لەگوڵ دەگرین
گوڵە سوورەکانی یەئس
دەخەینە ناو گوڵدانە تەریفەکانی ئایندە
بەڵام
بەچی دیارە هەناسەی چێژاوی رۆحم تەنگتر و
بینابیم تاریکتر نابێ
ئەی سەرزەمینی یادەکان
بەچی دیارە
بەچی

# کتێبێک

بلێ بە تەرمەکانی پشتی ئەسپ و
پێغەمبەرەکانی دەرەوەی بەهەشت
ئیتر تەواو.. لەدەشتایی گوماندا مان
چەترێک هەڵدەن بۆ سایەی ئاب ولێزمەکانی
کانوون
ئێمەش فرمێسکە وەریوەکانمان کۆدەکەینەوە
بە رەگی درەختەکانی باخچە هەتیوەکانیان
دەسپێرین
چی ماوەتەوە بۆ ئێمە..جگە لە کتێبێکی پڕاوپڕ لە
یادگار
کە لەسەر تاقچەی ژوورێکی بێ دەرگاو بێ
پەنجەرەدا
یەک یەک ساڵەکان لە خەلوەت هەڵدەکێشێ
خەلوەتی خەون و
جەنگی ساردو
ئاه و .... چڕین

خەونی فڕین وجەنگی ساردی نێوان ئەو
ڕەنگانەی
کە هێندە کاڵبوونەتەوە
هیچ فاڵچییەکیش نازانێ
لە بنەچەی کامە ڕەنگی کامە دونیان
ئاهی مرازو چڕینی ئەو گۆرانییانەی
هەر حەرفێکیان لەناو وردە گەڵا وەریوەکانی
ژووانەکان
بە ئەمانەت ناشتبوومان
کتێبێک هیچ یەکێک لە ڕەنگەکانی دیار نەماون و
هەموو حیکایەتەکانی چاخی بەردینیشی تیایە
کتێبێک کەس نایبینێ و دەچێتە دیدەنیی هەموو کەس
کتێبێک کە بیکەیتەوە غەریبتر لە هەناسەی
عاشقێک دەچێ
عاشقێک کە هەمیشە لەنێوان دۆزەخ و
بەهەشتدا دێت و دەچێ
دێت و دەچێ و پاگژمان دەکاتەوە
دێت و دەچێ و ......

## زەوی ئاسمان مرۆڤ
## گۆرانییەکیش
## بۆ مردن
## زەوی

تەنهابۆ ئەوە نیە

ژوورێک یا رەشماڵێکی لەسەر هەڵدەین

گوڵێک یا دەنکە گەنمێکی تیا بچێنین

کانی یا دەریایەکی لەسینەدا بدۆزینەوە

توولەڕێ یا شەقامێکی لەسەر دروست بکەین

خەون یا نێرگزەجاڕی لەسەر ببینین

وێنە یا نەخشەیەکی خڕی لەسەربکێشین

سەنگەر یا ژێرزەمینێکی لێ هەڵکەنین

سەرخەو یا جەستەی خۆمانی تیا بنێژین

زەوی بەخشندەیەبەخشندە

رێگامان پێدەدا

ئەم پێیە پیسانەمان

بەم پێڵاوەقورسانەوە

کەهەندێکیان دڕو تیژیشن

لەسەر ئەم سینگەنەرم وناسکەیدا

کەنەرموناسکە وەک سینگی ژن

دابنێین و

بەسەریدا سەفەر بکەین

بەرەو ژووان و دیدارەکان

بەرەو مەرگ

بەرەو ژیان

بەرەو خوا

بەرەو...

ئەم زەوییە بەخشندەیە بەخشندە

## ئاسمان

شینەو

هەندێجار بۆر

شەوانیش مۆر

هەندێجارێش رەش رەش

من چوار وەرزی ساڵ

بە ئاسمانەوە پەیوەستم

ئەو

لە شەوێکدا کە رەش رەش بوو

وایزانی ئیتر دەمرێت و

دەبێ هەرچی کەهەیەتی بۆ کەسێکی بەجێبێڵێ

من نزیکترین کەسی ئەو بووم

هەمووسامانەکەی ئەویش لەوکاتەدا رەنگێک

بوو

رەش رەش

ئەو رەنگەی پێبەخشیمو گوتی

با ئەم رەنگەبۆ چاوانی یارەکەت بێ

# مرۆڤ

هەندێجار جوانە

وەک رووبارو

پەرەسێلکەو

بەهەشت

هەندێجاریش ..نا

من هەمیشە لە کەمیندام

من راوچیم

من ..!

# گۆرانییەکیش بۆ مردن

بەسەر باڵەکانی باوە

جەنگێک دێت و یەکێک دەڕوا

تەمەن چۆڕ چۆڕ

دادەچۆڕێ

دواجار

دوای ئەوەی کە هەناسەیەکی نیوەچڵ بنکڕ

دەگرێت

دێتەوەیاد کە درەنگە

# جوانییەکانی جەنگ

١

شیعرو شەرابو شەڕیتۆ
هەرسێکیانجوانن
من ومەستی و منداڵیم
هەرسێکمان جوانین
کەواتە
وەرە با کۆکتێلێک دروست بکەین

٢

منداڵ دەبمەوە وەک جاران
دێمە سەر رێت و
چوکلێتێکت بۆ دەهاوێم
دەیکەیتەوە چوکلێت نیە
شەرم سوورمهەڵدەگەڕێنێ

دوورتر دەکەومەوە دەترسم بمگەیتێ و

سوورترم هەڵدگەڕێنی

سوور  سوور

٣

جەنگ داخم دەکا

داخ داخ

بەڵام ئەو جەنگە نا

کەمن و تۆهەڵیدەگیرسێنین و

عەشق خامۆشی دەکات

٤

تۆ جوانمدەکەیت و

عەشقت دەمکاتە بەفر

ئێستا من پیرە بەفرینەیەکی چواروەرزەی

سپی و جوانم

لەژێر هەر وەرزێک سەردەرکەم

نە بەفری لێ دەچێتەوە نەتۆ

٥

لەبەر چریکەی جەنگی بێدەنگی کۆترەکان

خۆمان رووت دەکەینەوە

رووت

رووت و قووت

هەقیقەت بە رووتی جوانە

٦

جوانتر لەشەوە شەرمشکاوەکان

هەناسەمان لەبەرئاوێنە پەرتدەکەین

دەمامکەکان

بۆ جەنگێکی دیکە دادەکەنین

جوانان دەمامکیان ناوێت

٧

بمبەو بمبەخشە بە نیگات

بمبەخشە بە رۆژەکانت

بمبەو چیتر بە دامرکانم مەسپێرە

بمبەو بمدەرە زۆزانێک

بێزاربووم لەم گەرمەسێرە

٨

دەگەڕێمەوە جەرگەی جەنگ

من کە جەنگاوەرێکی کارامەی جەنگەکانم

من کەختووکەی گشت جەنگێک بەخوێنمدا دێت و

دەچێ

وەک جەربەزەترین جەنگاوەری جەنگەجوانەکان

بۆ ئەوەی بەشداری لە جوانترین جەنگدا بکەم

دەگەڕێمەوە جەرگەی جەنگ

## دەرگا هی من نییە

دەرگایەک کرایەوە

گۆرانییەک هاتە ژوورەوە

سەمایەک هەستایە سەرپێ

خەونێک پشکووت

رووومەتێک

وەک پشکووتن سوور هەڵگەڕاو

جوان هەڵگەڕا

ئەوە رووومەتی شیعر بوو

دەرگا دیل و دەستبەسەرە

بەڵام گۆرانی نا

سەما نا

خەون نا

دەرگا رەنگی هەڵدەبزرکێت و

کۆن دەبێت و

دەشكێت
بەڵام گۆرانی نا
سەما نا
خەون نا

دەرگا
دەتوانین پێیدا بچینە دەرەوە
بەڵام گۆرانی نا
سەما نا
خەون نا

دەرگا هی من نییە
بەڵام گۆرانی هی منە
سەما هی منە
خەون هی منە

## مۆری‌و مەرجان

شیعرزادەی شەنگ کە هاتی

بە کەلێنی چاوەڕوانیما تێپەڕیت‌و

هەناسەت راگرت‌و

نەتهێشت بۆنت بکەم

لێرەوە

خەونێکت لێ دزیم‌و

جوانی‌و

چێژو

رەنگە کەسنەدیتەکانی بەهەشتت پێبەخشیم

***

وامزانی کە دێی

هەقایەتم بۆ دەگێڕیتەوە

وەك ئەو شەوەی بە هەقایەت

سێبەری خەونێکی سووکم بەسەردادایت

دەمخەوێنیت‌و

بە لێوە ئاشناکانتەوە دەڵێی: لێرەم

ئێرە وشەیەکی کورتە... زۆر کورت

بەقەد دووریی نێوانمان

***

سڵاو شیعرزادەی شەنگ

تەنیاییم تۆی لێ دەتکێت‌و

تۆش تك تك دەتکێیتە ناو یادەوەری

یادەوەریش

یا دەوەرێ

یا لەناو ئینجانەیەکدا

مەستتر لە شەوە کپەکان رادەکشێت

یا دەبێ بە مشتێ مۆری‌و مەرجان

مۆری‌و مەرجانیش تاهەتا

بە گەردنی نازدارێ دەدرەوشێتەوە

## بڵاوکراوەکانی سەنتەری نما ٢٠١٠-٢٠١١

| ژ | ناوی کتێب | نوسەر یان وەرگێر |
|---|---|---|
| ١ | جیهان لەدیدی کۆشنێر | و: شێرزاد هەینی |
| ٢ | ١٩٠٠ تێپەڕیوە | ئیسماعیل کوردە |
| ٣ | کوردو ئەرمەن | و: خالید هەرکی |
| ٤ | هەڵچونێك لە ناوێنەدا | زرار سەرتاش |
| ٥ | وێنەکانی لەبەر باران ونکردووە! | ئیسماعیل کوردە |
| ٦ | رەخنەی پراکتیکی | د. ئەبوبەکر خۆشناو |
| ٧ | گوڵەستێرەکان کوژانەوە/٢ | کەریم کاکە |
| ٨ | باهیرە | و: رێبین رەسوڵ ئیسماعیل |
| ٩ | کوردستان لەسیاسەتی هەرێمایەتیدا | د. کامەران مەنتك |
| ١٠ | ژن لەجیهانی ئەدەبی شێرزاد حەسەندا | هاوژین حەمەرەشید |
| ١١ | لەناو گێژاوی سیاسەتدا | ئیسماعیل کوردە |
| ١٢ | فەرهەنگی مەلیخا | ئومێد شێرکۆ شاکر مجروم |
| ١٣ | ماچی یەکەم | کەریم کاکە |
| ١٤ | کوردەکان | و: ئارام ئەمین شوانی |
| ١٥ | کوردستان و کوردەکان | و: خالد هەرکی |
| ١٦ | بروسکەی شوم | محەمەد کەریم ئانەوا |
| ١٧ | گۆرەپانی واشنتۆن | زیڤار قاسم |
| ١٨ | قاچێك بۆ شمشاڵ | قاسم شێروانی |
| ١٩ | میوانی ئاو | عەبدولوتەڵیب عەبدوللا |
| ٢٠ | سەمای دۆلفینەکان | د. ئەرسەلان بایز |
| ٢٢ | درەختی خامۆشی | کەریم دەشتی |
| ٢٣ | درەختی درەوشانەوە | کەریم دەشتی |
| ٢٤ | سێبەری خۆتم لێ حەرام مەکە | حەمە عەباس |
| ٢٥ | زمان و شێوەزارەکان | سەدیق سەعید رواندزی |